## وشەی پرشنگدار

**بە بێ خۆ بەستنەوەو بە بێ دوو دڵیو بە بێ ترس بنووسن ئەگەرچی دەوڵەت رازی بێت یان رازی نەبێت لەوەی دەینووسن...**

**سەرۆکی فەرمانده**
**صدام حسين**



# لەم ژمارەیەدا


# لەم ژمارەیەدا

# بەیان


گۆڤارێکی مانگانەی ئەدەبییە

سەرنووسەر

فؤاد حسين احمد

ناونیشان

دەزگای رۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی
وەزیریە تەمبێشت - المعهد الفضائی
ت ٤٢٥١٨٤٦ پێنج خەتە

BAYAN

LiterarY MonthlY Magazine
MinistrY of Culture and Information
The Kurdish House for Culture and publishing
Baghdad - Iraq  Issued by


سەرنج

هەر نووسینێک لەم گۆڤارەیەدا بلاودەبێتەوە
خاوەنەکەی بەرپرسیارە


ئابوونەی سالانە لە ناو عیراقدا «١٠/٠٠٠» دینارە

مۆنتێف و خۆش نووس نزار بەرزار


تکایە هەر نووسەرێک خەتەکەی خۆش و شاش و جوان نەبێ نووسینەکەی دەخرێتە پشت گوێ



# قارەمان صدام حسین و جەماوەری گەل



ماوەیەکە جەماوەری گەلی عیراق و نەتەوەی عەرەب بەهۆی
بیری وورد و هوشیاری ڕابەری نەتەوە
**هەڤاڵ صدام حسین خواپیارێزێت ، هەموو لست لا ئاشکراو
ڕوون بۆتەوەو هوشیارانە باری سیاسی ئاوچەکە لێک
دەدەنەوەو بەوپەڕی بڕوایە دەڕواننە پاشەڕۆژی پرشنگداری
نەتەوەی عەرەب کە یەکێتی یەکی بەهێز لە ژێر ئاڵای شۆڕە
سواری گەل کاک صدام حسین خواپیارێزێت پێک بهێنن ،**

چونکە جەماوەر بەچاوی خۆیان دەبینن چۆن سەرکردەی دانامان پەنجە دەخاتە نێو چاوانی زایۆنیزم و وەلامی هەڕەشەو

گورەشەی بەریتانیاو ئەمەریکا دەداتەوە، بەهەڕەشەیەکی توندترو تیژتر وەلامیان دەداتەوە پێیان ڕادەگەیەنێ کە عیراقی

ئەمڕۆ عیراقی ئەو کاتە نی یە کە بە هەوەسی خۆیان سیخوڕیان بۆ دەناردو سامانی عیراقیان دەدزی. عیراق ئێستا خاوەن

ڕۆڵەی هوشیارو زیرەك ودانا و خەم خۆری خۆیەتی ئیتر چۆن دوژمنان دەتوانن زەفەر بەم نیشتمانە مەزنە بەرن: :

**بەڵێ لە سایەی قارەمان صدام حسین عیراق و نەتەوەی عەرەب ئێستا لە قۆناغێکی تردا دەژین، قۆناغی نوێ، بەڵکو**

**چەرخێکی نوێ، بەتایبەتی لە دووی نیسانی ساڵی ۱۹۹۰دا، چونکە لەم ڕۆژەیەدا، کە بە ڕۆژێکی جیاکەرەوە**

«الفاصل»دەژمێردرێت لە بارەی زۆرانبازی نێوان عەرەب و دوژمنانی عەرەب، سەرکردە صدام حسین بانگەوازی داو

فەرمووی: «سیاسەتی قەدەغەکراو لەسەر عەرەب ڕۆیشت «عیراق ئێستا پێویستی بە لەتۆم نی یەکە قەوارەی زایۆنیزم پێ ی

هەڕەشەمان پێ دەکات، چونکە ئێمە کیمیاویی دووالنەمان هەیە، دەتوانین پێ ی نیوەی «ئیسرائیل»بسوتێنین، ئەگەر

هات و نیازی دوژمنکاریی لەگەڵمان دا بکات هەر لەو ڕۆژەی کە دوژمنان زانیان ئیتر هیچیان لە دەست نەماو دەستەپاچە

بوون بە ئاشکرا دەرکەوت کە میللەتی عەرەب هەنگاوێکی گەورەی هاویشتووە و لە بارێکی تردا دەژی و خاوەن

دەسەلاتێکی زۆر گەورەو مەزنە؛ ئەمەش لە زۆر لایەن دا بۆمان دەردەکەوێ؛

عیراق ئەمجارە بە جۆرێکی تر، بە جۆرێکی نوێ پرۆگرامی زانستی ی نوێ دادەڕێژێ بۆ بەرەنگاربوون و بەرگری:

لەکاتێك دا چەمکی «هاریکاریی عەرەب»تەنها قسەو گوفتار بوو و لە کۆنگرەکان دا دەوترا ئێستا لە سایەی قارەمان صدام حسین بوو بە ڕاستی یەکی تەواو، چونکە ئێستا هەرکەس

هەست بە لێپرسراوێتی ی خۆی دەکات، لێپرسراوێتی ی بەرانبەر بەنەتەوە.

ئێستا سەرانسەری گەلانی جیهانی ئەوە دەزانن، نەتەوەی عەرەب ئەوە دەزانێت کە عیراقی بەهێز بەناوی هەموویانەوە

قسە دەکات و دەبێ ئەو هەق و مافانەی کە زایۆنیزم پێش ئێستا دزیویەتی هەموو وەربگیرێتەوە. دەبێ زایۆنیزمی گومڕا باش

ئەوە بزانێت، کە ئیتر ناتوانێت هەڕەشە بکات کە دەست لە فلانە پایتەختی عەرەبی بووەشێنێ و وابکات و وابکات،

چونکە ئەگەر هات و شتێکی وای کرد، ئەوا دەستی لە بنەوە دەبڕێ و دەسوتێنرێ زایۆنیزم ئیتر ناتوانێت هەڕەشە بکات و

پشت بە بەریتانیاو ئەمەریکا ببەستێ

**چونکە عیراق لە ژێر سایەی قارەمان کاك صدام حسین خوابپارێزێت دەتوانێ بەرانبەری ڕاوەستێ و خەونەکانیان پووچەڵ بکات.**

# لوتکەی بەغدا

**دلشاد ایوب سعید**

# مسوگەرکردنی دوا رۆژی نەتەوەی عەرەبە

سەرۆکی فەرماندە صدام حسین دووپاتی ئەوەی کردەوە کە ئەو هێرشە دوژمنکاریەی ئەمەریکاو بەریتانیاو زایۆنیزم دژی عیراق تەنیا بۆ سەر عیراق نی یەو بەڵکو هێرشێکە سەر نەتەوەی عەرەبی بەگشتی بەڵام ئەمجارەیان لەم قۆناغەدا نیشانەیەکی بۆ هەڵبژاردوەو لە هێرشە دژایەتی یەکەیدا زۆرتر بۆ سەر عیراقە چونکە عیراق نیشانەی عەرەبایەتی و نەتەوەی عەرەبی هەڵبژاردوە. ئەمە لە لایەك وەلە لایەکی ترەوە هۆی سەرەکی ئەم هەڵمەتەدوژمنکاریەی ئیمپریالیزم دژی عیراق

لەبەر ئەوەیە چونکە عیراقی صدام حسین کرۆشی بۆ ئیمپریالیزم نابات و خاوەن بیرو باوەرو بیرێکی سەربەستی

خۆیەتی ئەمەش بووە مەترسیەکی گەورە بۆ ئیمپریالیزم سەرۆکی فەرماندە صدام حسین لە کۆنگرەی عەرەبی میللی پشتگیری کردنی عیراق دا لەم بارەیەوە وتی :

**ئێمە لەگەڵ ئەوانە داین کە دەڵێن هەڵمەتەکە تەنها بۆسەر عیراق نییەو بەس بەڵکو بۆ سەر نەتەوەی عەرەبیە : ئەم ئاستەیان هەڵبژارد**

•

لەم هێرشە ئاشکراو راستە وخۆیەوە لە لایەك ئەوانەی کە بەگەورەکان ناونراون چونکە بچوکەکەیان نەیانتوانیوە ئامانج وەجێ بێنن لەم بارو زروفەو ریبازەدا کە دەیزانن و ناچار کراون بە

هەڵبژاردنی ئەم کاتە وا خواناکانیان نایەوێت نەتەوە پێشکەوێت و نایەوێت نەتەوە مرۆڤایەتی خۆی بپارێزێت و پێداویستەکانی

پارێزگاری کردنی رۆڵی مرۆڤایەتی بە شێوەیەکی راست وەجێ بێنێت :

لێرەدا دەڵێین بەستنی کۆنگرەی لوتکەی نائاسایی عەرەبی لەبەغدا لە ۲۸ / ئەم مانگەدا چەمکێکی تایبەتی هەیە لەو قوناغەی ئێستادا بەتایبەتی بۆ بەرەنگاربوونی ئەو هێرشەیەکە ،

ناراستەی عیراق کراوە . کە تەنها مەبەستی تەنیا عیراقەو بەس بەڵکو مەبەست هەموو نەتەوەی عەرەبە بۆیە پێویستە لەم کۆنگرەیەدا کەلە بەغدای سەرکەوتن و ئاشتی دەبەسترێت

هەڵوێستێکی وای لەپێش بگیرێت کە قەوارەی زایۆنیزم هەستبکات کە هەموو دەروازەکان لەبەردەمیدا والاین کە هەر کاتێك بیەوێ سەرکێشی خۆی ئەنجام بدات وە ئەم کۆنگرەیە

لەو بارو دۆخەدا دەبێت وەکو کۆنگرەکانی پێشوو نەبێت بەڵکو پێویستە لە کۆنگرەکانی پێشوو زۆر زۆر جیاواز بێت تاوەکو

وانیشانی جیهان بدەین کە ئێمە خاوەن مافین و ئێمە بەردەوامین لەسەر رەوتی خۆمان بۆ گەیشتن بەهیواو ئامانج و ئارەزووی خۆمان شان بەشانی یەکتر.

وەبۆ ئەوەی ئەم کۆنگرەیە سەر بکەوێ و سوودێکی تەواوی هەبێت دەبێ نەتەوەی بەگشتی باری خۆی چاك بکات و

ناکۆکی نێوان دەوڵەتەکانی لا ببرێت و رێگە یەکی دروست و راست بگرێتە بەرخۆی تا وەکو بتوانێت

**لەگەڵ جیهاندا هەڵس وکەوت بکات . چونکە گەورت گەرنتا جوتی نەتەوەی عەرەبی هۆی هەرە سەرەکیە کەوا**

**لەقەوارەی زایۆنیزم دەکات کە دەست درێژی بکاتە سەرو لە سەر حیسابی خاکی عەرەب قەوارەی خۆی فراوان بکات .**

**چونکە ئێستا عەرەب بەگشتی رووبە رووی مەترسی یەکی زۆرە ، کە لەمەترسیەکانی ۱۹٤۸دا شوێنەواری کەمتر نییە :**

**سەرۆکی فەرماندە دەفەرموویی ئەوە بەسە بۆ ئێمە کە هەمیشە ئەوە لە یادمان بێت کە خێزانێکین لەرێگەی هەموو شتێکەوە**

**کەچاکەی بۆ مرۆڤایەتی هەبێت و ئێمە لەیەك خێزانەوە پێك هاتووین تا وەکو بە هەڵوێستێکی تە بابیەوە نارەزایی خۆمان دەربڕین بەرانبەر هەموو شتێك کە ئازاری مرۆڤایەتی دەدات**

**یاخود رێگەلە هەموو پێشکەوتنێکی رەوای هەڵچوونی یەوە بۆ دووپات کردنەوەی خودی خۆی بێ ئەوەی دەست لە خودی ئەوانی ترەوە وەربدات بگرێت .**



# صدام حسین ی قارەمان و کۆنگرەی باڵای عەرەب

● کرم علی محمد

بارودۆخی ئێستای وولاّتانی عەرەب و گۆڕانی هەندێ ڕووداو لە گۆڕەپانی ناوچەکەو گۆرەپانی دەوڵە تان دا بەشێوەیەکی گشتی ، ئەم کۆنگرەیەی هێنایە ئاراوە .

دیارترینیان هاتنی جوولە کە لە سۆڤی یەتەوە بۆ خاکی داگیرکراوی فەلەستین ، کەبە کارێکی نارەواو خەتەرناك لە قەڵەم دەدرێت ، چونکەهەرەشە لە بوونی عەرەب دەکات و زیاتر هانی زایۆنیزم دەدات بۆ هەرەشەکردن و هەڵسان بەکاری قۆری نارەوای نوێ .

هەروەها هەوڵدانی ئیمپریالیزم وزایۆنیزم بۆ کۆسپ خستنە ڕێگای پێشکەوتنی زانستی وولاّتانی عەرەب دا دیسانەوە یەکێکە لەو خاڵە نوێیانەی باری ناوچەکە کەسەرنج ڕادەکێشێ و دەبێ لەلایەن عەرەب و هەموو میللەت و نەتەوەو دەوڵەتە پێشکەوتنخوازەکانەوە وەلاّم بدرێتەوەو دەبێ زایۆنیزم وئمپریالیزم خولۆدۆ بکرێت و سنور بۆ کارە چەوت و ناراست و نارەواکانیان دابنرێن .

سەرانسەری جیهانییش ئەوە دەزانن کە نیشتمانی عیراق لەژێر سایەو ئالاّی کاك **صدام حسین خوابیپارێزێت هەنگاوی هەرە گەورەی لەپێشکەوتنی زانست و تەکنیك دا هاویشتووەو بەردەوامەو** کاری واش بۆ خزمەتی عیراق و نیشتمانی عەرەب و مرۆڤایەتی سوود بەخش و قازانج دارە . چونکە مەبەستی عیراق تەنها بۆ ئاشتی و هێمنی یە .

بەلاّم دام و دەزگاکانی ڕاگەیاندن لە ئەمەریکاو بەریتانیا هێرشی نابەجێ و نادروست دەکەنە سەر عیراق ، گوایەعیراق بەچەکی نوێ هەرەشە لە زایۆنیزم دەکات ، ئیتر باسی ئەوە ناکەن چۆن ماف دەدەنە زایۆنیزم خاکی عەرەب داگیربکات و گەلی فەلەستین ئاوارە بکات ، ئەمە بەکارێکی ڕەوا دەبینن .

بەلاّم ئەگەر هات و عیراق چەکێکی نوێی دروست کرد ، یان یارمەتیی گەلی فەلەستینی دا ئەوا بە کارێکی نارەوا لەقەڵەمی دەدەن ، کورد وەتەنی یەکە «بۆمن حەلاڵەو بۆتۆ حەرام »لە چەرخی بیستەم داکەی شتیوا دەبێ و چۆن بەتوندوتیژی وەلاّم نادرێتەوە .

لەم کۆنگرەیەدا بۆزایۆنیزم و ئیمپریالیزم دەرکەوت کە میللەتی عەرەب توانای ئەوەیان هەیە مافی بپارێزن و هەرگیز سڵ لە بەرگری نەکەنەوەو بەیەك دڵ و یەك مێشك بڕیاربدەن و بیربکەنەوە .

لەم کۆنگرەیەدا ڕۆژی روناکی و شادیو خۆشی لە ئاسۆ دیارەو ئامانج و ئاواتی هەرە گەورەیمیللەتی عەرەب دێتەدی .

# نامەیەکی تر.. لە بۆ هەڵێکی تر



کامل جمیل

ساڵـەکـانی جەنگ و ئەو دەست درێژکردنەی کە رژێمی ئێرانی چەسپـانـدبـوویـە سەر عیـراق بە هەمـوو شێـوەیەك لە رەفتارو رێـــرەوێـکی ئازاردان و ترسنـــاك بەســـەر ژیــان لە ئێـــران و کارتێکـردنی بەســەر هەموو لایەنەکانی ئابووری و کۆمەلایەتی و رامبـاری‌دا هەمـووشی نیشـانـەی وێنەیەکی نالەباری مێشکی ئێـرانی دایـەو مەتـرسی بەسـەر مرۆڤـایـەتی بە تێکـراو بەسـەر ناوچەکەداو ئێرانیش بە شێوەیەکی تایبەت.

کاربەدەستانی ئێرانی کە سوورپیشن بەسەر ئەو ڕاقتارانە : ئێمەنامانەوێ بۆرابووردوو گیروگرفتەکانی بگەڕێنەوە ، بەڵکو ئەمانەوێ ئێران بێتەوە سەر خۆو ئەو تەم و مژەی کەبەر چاویان گرتووە لابدەن و بێنە سەر ڕێگای ڕاست و دروست ئێمە کە ئامێزە بۆ ئەم لایەنە گرنگە دەکەین دووپاتی دەروون پاکی و دڵپاکی عراق دەکەین بە سەرۆکایەتی سەرکردەی سەرکەوتوو صدام حسین خوابپارێزێ کە هەمیشەو لە هەر کاتدا هانی ئێران ئەدا کە خۆیان لەم کارەساتە رزگار بکەن . بەڕێزیان لەم بارەوە نیشانەی رۆحیەتی مرۆڤانە برِوای ڕاستەقینە

لە وتارەکەیدا لەگەڵ سەرۆك و ئەندامانی لیژنەکەدا روون کردەوە وتی (ئێران پارمەتی دەدەین بۆ ئەوەی هەنگاو بەرەو ئاشتی بهاوێژێ . لە بەسرەو فاو بیناسازی دەکەین و بە ئێران دەڵێین کە کات وژیان بۆ بینا کردنە نەك بۆ رووخاندن) ئەم وتارە بەنرخە بەتەواوەتی ئەوە ئاشکرا دەکات کە پەیوەندیەکی ئاسایی لە نێوان هەردوو وڵات داپێك بهێنرێت :

بەڕاستی نامەیەکی مرۆڤانەو گەورەیە ئاراستەی کار بە دەستانی ئێران کراوە بۆ ئەوەی لێپرسراو بن بەرامبەر بە هێمنی و ئاسایش لە ناوچەکەداو مافی هەردوو وڵاتەکە بە تەواوی بپارێزرێت و ئاشتی یەکی هەمیشەیی و بەردەوام بە زمان و کردەوە لە نێوان هەر دوولاوەدی بێت .

لەم قوناغە کە ئێران تیایدا تێ دەپەڕێت پێویستە بە لوولی و ڕامان بیر لە خۆیان بکەنەوە بە بڕیاری ئاشتی گشتی وەکو پاسایەکی ژیان رازی بن و واز لە بیرکردنەوەی تەسك و دەرباز بوون لە بیرکردنەوەی خومەینیەت و پووچەڵ کردنی سیاسەتەکانی و رازی بوون و هێنانە دی ئاشتی نێوان هەر دوولادا بە پێی بڕیاری ئە نجومەنی ئاسایشی نێو دەوڵەتانی ژمارە (٥٩٨) و زیندوو کردنەوەی گفتوگۆ کردنی ڕاستەو خۆ بە رۆحییەتێکی تازەو گرتنە ئەستۆی هەموو لێپرسراو بەرامبەر هەموو بڕیارێك بۆوە ئەنجام گەیشتن و وەدی هێنانی ئاشتی یەکی ڕاستەقینە لە نێوان هەردوو وڵات دا

ئەم دەروازەیە ڕاستەقینەیەك دەردەبڕێ [illegible]

[illegible] بەسینی وەکو رەوشت [illegible] هەرگیز فەرامۆش ناکرێ [illegible]

یەخسیرەکان یاری نەکات و لەسەر یاسای (١٠١) [illegible] جنێف سالی سالی ١٩٤٩ بو بەرەلا کردنی [illegible] دانراوە جموجوڵ و ڕەفتار بکات بێ ئەوەی ئەم کارە بە هیچ خالێکی پەیمانی ئاشتی ببەستێت .

بەنیسبەت هەڵوێستی عیراقیشەوە هەموو میللەتانی ئێران بەچاکی ڕەفتاری مرۆڤانەی عیراق دەزانن لە سەرووی ئەمانەش دەست پێشخەری سەرۆکی فەرماندە صدام حسین لە کاتی چاوپێکەوتنی بە سەرۆکی ڕێکخراوی پێشکەوتن خوازی نێودەوڵەتان لە دەی ئاداری ڕابردوو ئامادە بوونی عیراق دەربارەی ئالوگۆڕ کردنی تێکرای یەخسیر [illegible] ئەم بۆچوونەی ئێمەش بەڵگەیەکی دروستەو زۆر فت دەربارەی بارودۆخی ئێران دەگەیێنێ چ لە سەر ئاستی ناوچەکەو عیراق دا وچ لە ئاستی جیهان دا . هەموو کاربەدەستانی ئێرانیش باش دەزانن و پێش هەموو کەس کە سیاسەتی جەنگ و دەست درێژی بەسەر عیراق و ناوچەکەو زیان بەخۆیان دەگەیەنێ و هەرگیز بەکەڵکیان نایەت وخۆیان لە گۆشەیەکی تەسك مەلاس دەکەن و هەموو دەوڵەتانی جیهانیش لێیان دوورە پەرێزدەبن .

لەبەر ئەم رووناکی یە دەبێ ئێران بارودۆخی خۆی و ڕەفتارە چەوتەکانیان لەگەڵ هەموو دەوڵەتالدا بە شێوەیەکی ڕاست و دروست چاك بکەنەوەو ڕێز لە هەموو لا بگرن لە ژێر سایەی ئەو دروشمانەی کەلە نێوان دەوڵەتان دا باوە .

# خۆماڵی کردنی نەوت



گەلاوێژ حەسەن

جەنگی خۆمـــاڵی کردنی نەوت جەنگێکی بێ هاوتـای بوو لە مێـژووی گەلی عیـراق بە شارەوای زۆری لەسـەر ووتراو حزب زۆری لێ لێکـۆڵیـەوە هەتا گەیشتە ئەنجامی جێ بە جێ کردنی هێنـانـە دی. سەرۆکی قارەمـانمـان سـەرکـردایـە تیەتی خۆماڵی کردنی دروست کردو رابـەری کرد.

سەرکردایەتی شۆڕش هەر لە بنەڕەتەوە کە حوکمداریەتی گرتە دەست لە عیراق هەموو هەڵوێستێك و کارێکی بە ئاشکرا روون کردۆتـەوە بۆ گەلـەکـەی تا بزانێ لە سەرچ بناغەیەك و نەخشەیەك ئەم کارە دروست ئەکاو جێ بە جێ ی ئەکا هەروەها لە هەمــوو کاتێکـداو بارو دۆخێکـدا ئاشکـرای کردووە ڕوو بە

ڕووی گەلەکەی کە چ بەرپرسیاریەك لە بەردەوامی کاروانـدا لە ئەستـۆیـەتی هەر لە سەر ئەم بنـاغـەیـەو نەخشـەکێشانە بێ هاوتایە خۆماڵی کردنی نەوت دانرا بەبە شێك لە شۆڕش بەڵکو

پێـویستیـەك بوو لە پێداویستیەکانی ئەم کاروانە. یەکی ئادارو یەکی حوزیران لوتکەی پێویستیەکانی قۆناغ بوو.

شۆڕش هەر لە سەرەتـــایـەوە. بیـرو باوڕی بە قۆنـاغی بە جێ هێنانی ئەرکـەکـانی رزگاری و بیناکاری دیموکراتی میلی بوو. هەروەهـا بە پێـویستی زانی کە سامانی نەوت بەتەواوی رزگار بکرێ و بخرێتە ژێر رکێفی دەستەڵاتی گەلەوە لەخزمەتی گەل و شۆرشـدا بێت. لـە بەر پێـویستیـەکانی ژیانی ئەم چەرخەمان ئاوات و ئامانجی گەلەکەمان دەبوایە ئەم کارە سەری بگرتایە بۆ بەدی هێنانی بەرنامەو ئامانجە کانمان ئەگەر سەریش نەکەوتایە خوانەکا بارو دۆخمان زۆر لە ئێستا جیاواز ئەبوو.

کاروانی ژیـانی گەل و شۆڕش ئەو قۆنـاغـەی کە باسمـان کرد زۆر بەپێویستی ئەزانی چارەسەری مەسەلەی سامانی نیشتمانی دەدا. بە تایبـەتی سامـانی بتـرۆل چونکە زۆر بەڕوونی هەموو

گەلی عیراق ئەیزانی هەڵسوکەوتی باری کۆمپانیا مۆنۆپۆلەکان لەگەڵ بەرژەوەندیو سوودی عیراق نە ئەگونجا.دەبوایە ئیمە دەست بگرین بە سەرماڵی خۆمانا. سامانمان بۆبیانی نەڕوا وەزۆر بە ئاسانی خۆماڵی نەهاتە کایەوە بەڵکو یەکەمیان ئەوە بووسەر پێچی کۆمپانیەکان بەرامبەر داواکاریە رەواکانمان هەروەها هەوڵدان بۆلەناودانی ئەم هەنگاوە بەڵام سەرکردەو هەڤاڵان لە شۆرش ئەمەیان لێك دابووەوە. ئەم کردەوایان لاسەیر نەبوو جا هەر لە بەر ئەم هۆیە سەرەکیە لەپێش یەکی حوزەیرانی ١٩٧٢دا قسەی لەسەر کراوە لە پێداویستیەکانی کۆلرابوونەوەو لە هەموو لایەنێکیەوە ئەشیانزانی ئەنجامەکانی چیە مێژووی لێکۆڵینەوە بەم کردەوەیە لەمانگەکانی تەموزئ ئابەوە لە ساڵی ١٩٧٠دا دەستی پێ کردبوو.

لە کانوونی دووەم و شوباتی ١٩٧٢ دیسان باسی شێوازی خۆماڵی کردن کرا لەگەڵ کۆمپانیاکاندا بەڵام وا دەرکەوت کە سوورن لە سەر شێوازی پەیوەندی پێشوبەبێ گۆڕانێلێرەدا بە گوێرەی ئەو پاشگەزبوونەوەی کۆمپانیەکان کردیان دەربارەی داواکاریە رەواکانمان لەم کاتەدا برگەی گرنگ لە بەیاننامەی خۆماڵی کردنی نەوت کەلەیەکی ١٩٧٢ ڕاگەیەنرا نووسرا بوو

ئەوەی شایانی باسە یەکی حوزەیران کارێکی شۆڕشگێرانە بوو .هەروەها یەکی ئادار وەك سەرکەوتنی تەواو کوت وپڕ بوون نەك بۆکۆمپانیەکانی ئیمپریالیزم بە تەنیا بەڵکو بۆهەموو جیهان کۆمپانیەکان هەتا ڕۆژی یەکی حوزەیران هەتا کاتی ڕاگەیاندنی خۆماڵی کردن خەیاڵی ئەوەیان نەدەکردەوە ئیمە ئەم هەنگاوە ئەنێین وسەر ئەکەوین.

لە ئەم بەرهەم بەدی هێنانە هەڤاڵی تێکوشەرمان صدام حسین خوا بیپارێزێت دەورێکی باڵای هەبوو لەم کارە مەزنەدا لەکاتی چاوپێکەوتنێك لە گەڵیا لەلایەنی ڕۆژنامەی (الثورة)دا ئەم وتارە بە نرخەی لە وەڵامدانەوەیەکدا ڕوون کردەوە[دوای یەکی ئادار لەحزبدا ، پێویستی نەکەوتنە جۆر هەڵەیەکەمان دووپات دەکردەوە کە زۆر جار پێشەواو ڕژێم وحزبەکان لەوەبەر لێی کەوتوون. سەرکەوتن لە وانەیە ببێتە هۆی لە خۆبایی بوون و لێل بوونی روانینی ئاشکرا لە کاتێکدا وای دەبینین سەرکەوتن لەسەر شۆرشگێران پێویست دەکات بێ فیزبن وکێشەی خۆیان بپارێزن ورد بین بن وتوانای بەکارهێنانی ورد ترین پێوانەیان هەبێ لەسەرکردایەتی کاروانی پاشە ڕۆژدا وە دەبێ هەموو سەرکەوتنێ بە پێوانەی پەیوەندی بە شۆڕش عەرەبەوە بێ [سەرۆك صدام حسین ل ٤٥]

[صدام حسین دەربارەی جەنگی نەمری خۆماڵی کردن]
هەر سەرکەوتنێ لە چوار چێوەی هەر وڵاتێکدا هەنگاوێکە لەسەر ڕێگای ئامانجی مەرکەزی شۆرشی عەرەب ئەمە مەرجی ئەوە پێویست دەکات کە روانینی شۆرشگێریو نەفسی شۆرشگێر پارێزگاری بکرێو سوور بووین لەسەر دووپات کردنەوەی ئەم مەسەلەیەلە ڕۆشنبیر کردنی ناوخۆیی حزبداو لە ڕۆشنبیرکرنی جەماوەردا وورپایشمان دەربڕیوە لە هەڵەی خلیسکان بەرەو شل بوونەوەو لە دەسن دەرچون دوای سەرکەوتنی یەکی ئادار. گیانی قوربانی دان وپلەی چاو کراوەیی کە بریاری یەکی حوزەیران دروستیان کرد دەبێ پارێزگاریان پێوەبکرێ لە ڕوویە ڕووبوونی هەرپیلا نێکی ئیمپریالیزم وکۆنە پەرست ومۆنۆپۆلی ، باوەڕ بەخۆبوون کارێکی بنەڕەتی سەرکردایەتیەکان تێکۆشەران وجەماوەرە بەڵام ئەم باوەڕ بەخۆبوونە دەبێ بەرەو لەخۆبایی بوون نەڕوات و سەرکردایەتیەکان و تێکۆشەران جەماوەر توانای دۆزینەوەی وردە حساباتیان نەبێ بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی چاوەڕێ کرا و ی پاشە ڕۆژ وحساباتی کوت وپڕ.
(سەرۆك صدام حسین)
لەم وتارە بە نرخەدا دەوری باڵای سەرۆکی فەرماندە صدام حسین خوا بیپارێزێت دەر ئەکەوێ کە چەند تێکۆشەرو دڵسۆزی ئەم گەلەیە وەچەندیش بە درێژای تەمەنی تێکۆشەرایەتی سەرنجی دووری دوا ڕۆژی کردەوەو چەند دەورێکی گرنگی بووە لە چەسپاندنی خۆماڵی کردنی پترۆل بۆ ئەوەی بەرهەم وخێری بۆگەلەکەی بگەڕێتەوە ئا ئاوا بەم جۆرە سامانی عیراق گەڕایەوە بە سەر بەستی بۆگەلی عیراق بۆبنیات نان وخێر خوازی پەرەسەندنی وڵات وبەرگری دژی پیلانی دوژمنان .
لەم وتارە سوودم لەووتاری
[ صدام حسین دەربارەی جەنگی نەمری خۆماڵی کردن دەدوێت]

# (شانۆی دەروونی.. شانۆی چارەسەرکردنی دەروونی)

نووسینی: د. بدرخان السندي
گۆڕینی: د. عبدالستار طاهر شريف
(لەعەرەبی یەوە بۆ کوردی)

مۆرینۆ و دیمەنی بەرەڵلایی

«لاوێك لە تەمەنی شانزە ساڵی دا هێشتان قوتابی قۆناغی خۆ ئامادەکردنی خوێندنی نۆشداری یە یاری یەکان و شانۆ سەرنجی ڕادەکێشن و جار نەجارێکیش یاری منداڵان هەڵوێستێکی پێ دەکەن لەگەڵ دیمەنە بەرەڵلایی یەکانی وتووێژی نێوان خەڵکی لەژیانی ڕۆژانەیان دا. زۆر جار دەبینرا کە شەقامەکانی (ڤینا)ی دەپێوا بە هاتووچۆکردنەکانی لە سەرەتای بیستەکان دا»

ئەم لاوە (مۆرینۆ)بوو، دامەزرێنەری قوتابخانەی شانۆی دەروونی بوو بۆ چارەسەرکردنی دەروونی، psychodrama.

لە سەرەتادا مۆرینۆ پێویستی بە کاتێکی زۆر هەبوو بۆ خوێندن و ئامادەکردنی ڕۆژانە، بەهۆی خوێندنی لە کۆلیجی نۆشداری دا بەڵام شانۆی لەبیر نەدەچوو، کەم درێغیشی نەدەکرد لە ئامادەبوونی شانۆکان.

بەڵام هەندێ شت وای لێ دەکرد لەزەت لەبینینی شانۆکان نەکا ئەویش بە هۆی هەستیارێتی زیاد لەبینینی (تەکلیف لە خۆکردنی لە نواندن دا) مۆرینۆ لە ڕێگای ئەو شانۆگەری یانەی کە پێشەکی دەقەکانیان ئامادەکرابوون و دەورەکانیانیش پێشەکی مەشقی لەسەر دەکراو چەند جاریش دووپات دەکرانەوە، بارێکی بۆیان دۆزیبووەوە. ناوی لێ نا (نەخۆشی ناداهێنان)جارو باریش زاراوەی (نەزانی)یان سووکێتی (التسفيه)بەکار دەهێنا لە جیاتی نەخۆشی ناداهێنان.

مۆرینۆ جار لەدوای جار زیاتر خووی دەدایە دیمەنە بەرەڵلای یەکان و (العفوية) بەرامبەر دیمەنەبەرەڵلایی یە زیندووە کانیش زۆر دەوەستا، کە لە ئەنجامی چاوەدێری ڕۆژانەی ژیانی خەڵکی چاوی پێ دەکەوت و زیاتر سرنجی ڕادەکێشاو دیقەتیانی دەدا. تا وای لێ هات هزری شانۆ بەرەڵلایی یەکان جێگیربن و بچەسپێنی لە دەروونی دا یان ئەو شانۆیانەی مەشقیانە لەسەر نەکرابوو، کەواتە، دراما دروست نەکراوەکان وەك هزرێك لەجۆرێ لە جۆرەکانی هونەرەکان پێش ئەوەی ببێتەبابەتێك کە پەیوەندی بەچارەسەرکردنی دەروونی یەوە هەبێ لەمێشکی مۆرینۆدا دەخولایەوە.

ڕۆژ ی لە ڕۆژان بەدیار کۆمەڵێ منداڵانەوە ڕاوەستابوو، لەیەکێ لەسەیرانگا گشتی یەکانی (ڤینا)تەمسیلی هەندێ مەتەڵی جنۆکەیان دەکرد، زۆر خۆشحاڵ بوو بە چاوپێکەوتنی بە نوێ داهێنانەکانیان ئازاد ی یان لە دەربرینی وشەکانیان لەکاتی دروستکردنی شانۆکانیان، کە هەر خۆیان لەکاتی نواندنی دا دەقەکانیان دادەنا کەوتە بیرکردنەوەی ڕۆژگاری منداڵێتی خۆی و کەوتەوە یادی، کە چۆن لەگەڵ کۆمەڵێ لە هاورێکانی

شانۆگەری (خواوپەرییەکانیان)دەنواند. ئەو کاتە مۆرینۆ لەتەمەنی چوار ساڵ و نیو بوو، ئەو شانۆگەرییە بە یەکەم تۆوی هزری شانۆی دەروونی (سایکۆدراما) دادەنێ، کە لەبیر چووبووەوە لەناخی مێشکی دا بوو بوو. ئەو یاری کردنە یان باشتر بڵێین ئەو شانۆگەرییە هاتەوە بیری کە لەگەڵ هاوڕێکانی دا دەیکرد لەبنی نهۆمی ماڵەکەیان دا. ئەو مێزە دارینە گەورەیە ژمارەیەکی کورسی بە دەوروپشتی دا داندرابوون:

مۆرینۆ سەرکەوتبوە سەر بەرزترین کورسی و دەوری خواوەندی دەبینی و منداڵەکانی تریش لەسەر مێزەکە ڕاوستابوون، دەوری پەرییەکانیان دەنواند کەچۆن دەوری خواوەندەوە دەسووڕانەوە و خەریکی جۆرە جوولانەوەیەک بوون وەک هەڵفڕین، کە گوایا پەرییەکانن و لە شەقەی باڵ دەدەن بۆگەیشتن بەتەختی خواوەندەکان. بەڵام یەکێ لەمنداڵەکان (پەرییەکان)ئەم بیرەی زۆر بەلاوە پەسندو خۆش بووتا وای باوەڕکرد لەو کاتەدا کەوا مۆرینۆ بەفڕین گەیشتۆتە سەرکورسی یەکەوە لەویش لەسەر مێزەکەوە بازدە داوبفڕێ، کاتێکی زانی لەسەر مێزەکە بەرەو بووەو هەموو لەشی دەهەژێ و قۆڵێکیشی دەشکێ:

کاتێ مۆرینۆ ئەم ڕووداوە دەکەوێتەوە بیری، دەڵێ تاقیکردنەوەیەکی بەرەڵڵایی بوو (عفویة) بەڵام شوێنەوارە دەروونییەکانی لای ئەو منداڵەمە لایکەتەی کەوتە سەرزەی مابووەوە هەندێ هەستکردن وشوێنەواری دەروونی تا ئێستاش کاردەکەنە سەر دەروونی مۆرینۆ تادەگا بەتەمەنی پیریش، هەستکردن بەخۆشی لەکاتی بەبیرهاتنەوەی ئەو دیمەنە لەگەڵ هەستکردن بە پاکی وخاوێنی و بەرەڵڵایی، تائەم ڕادەیەش مۆرینۆکێشەی چارەکردنی دەروونی نەدۆزیبووەوە بەڕێگای شانۆدا، بەڵام لەسنووری باوەڕی دابوو. دیمەنەکانی یاهەڵوێستەکانی شانۆگەریی لەوانەیە شوێنەوارەکانیان بۆماوەیەکی دووروودرێژ لە دەروون دابەجێ بهێڵن تاجارێکیان مۆرینۆچاوی بە تەنگوچەڵەمەیەکی کەسێتی کچێ لە کچە لەکتەرەکان دەکەوێ لەگەڵ دستگیرانەکەی داکە هەردووکیان دەورەی شانۆکە ناتەبابوون لەگەڵ یەکتری دا، لەوەبوو مۆرینۆ بیری لەوە کردەوە کە دەبێ (ئیحتمالی) چارەسەرکردنی ئەم ناتەبایەی نێوانیان چەند هەبێ لەگەر بێتو هەردووکیان هەڵسن بە دەوری دوو مرۆڤی نەگونجاوو ناتەبا لەگەڵ یەکتردا لە دیمەنێکی شانۆگەری دا، بەو جۆرە بیرۆکە کە بە مێشکی مۆرینۆدا تێپەڕی بۆ چارەسەرکردنی تەنگوچەڵەمەکانی کەسەکان بەم جۆرە ڕێبازە، لەوەبوو ناتەبایی یەکەی نێوان ئەم دوو دڵدارەی چارەسەرکردو ئەم کارەش بووە هۆی لە دایک بوونی شانۆی چارەسەرکردنی دەروونی کە ناونرا بە سایکۆدراما Psychodrama.

بەم جۆرە مۆرینۆ بەردەوام بوولەسەر بایەخدانی بەشانۆگەریی و دروخستنەوەی شانۆگەریی لەدیمەنە دەستکردەکانی وهزرە لەقاڵب دراوەکان نەک تەنها لەبەرمەبەستی زانستی ودەروونی و بەس بەڵکو بەوباوەڕەی کەوا شانۆلەوانەیە داهێنەرتر بێ لەگەر بێتو ڕێبازی بەرنامەی بەرەڵڵاری بگرێتەخۆ.

## مەبەست لە شانۆی دەروونی چی یە؟

پێویستە ئەم زاراوەیە بە جۆرێکی ئاسان و گشتی بناسێنین، بۆ ئەوەی توانیمی زانینی ئامانجەکانی (شانۆی (شانۆی دەروونی)مان بێ لەگەڵ شێوەکانی تەکنیکی کەتیایا بەکار دەهێنرێ، گۆڕینی دەقی ئەم زاراوەیە Psychodrama بەواتای (شانۆی دەروونی یە) بەڵام واتای فراوانترو ڕاهێنانێکی (تطبيق) (چارەسەرکردنی نەخۆشی یە دەروونیەکانن بەڕێگای شانۆدا). کەواتە (سایکۆدراما) دادەندرێ بە ڕێبازێک لەڕێبازەکانی چارەسەرکردنی کۆدەروونی (النفس الجمعي). ئامرازێکە هەوڵی ئاشکراکردن و دەرچواندنی هەستە شاراوەکان دەدا لە دەروون دا لەگەڵ هۆیەکانی تەنگوچەڵەمە کەسایەتی یەکان و دەربڕینەکانیان، ئەویش بە ڕێگای دەورەکانی شانۆگەرییە بەرەڵڵاکان. لەمەش کۆمکارییکە (عمل جمعي) لەسەر نواندنی هەستە سۆزییەکان دەدوێ لە پێناوی بەدیهێنانی دوو ئامانجی بنەڕەتی:

یەکەم: پاک کردنەوەی دەروونی بەڕێگای پشوودانەوە (التنفس)یان بەهەڵ ڕژاندنی دەروونی (الافراغ النفسي)
دووەم: پەیداکردنی جۆرە ڕەوشتێکی تازە.
ئەم دوو ئامانجانە بەهۆی کێشەیەکی دەروونی کەکاتی

ئەکتەرەکە بابەتێکی سەرپێی(ارتجالي)دەنوێنی بە شێوەیێکی بەرەڵڵایی و بەرەوڕۆژی جیهانی تایبەتی خۆی و تەنگوچەڵەمە کەسایەتی یەکانی وئارەزووەکانی وئامانجەکانی.

## بەرەڵڵایی و داهێنان:

دەبێ ئەوەمان لە یاد نەچێ کەوا هەوڵدانە سەرەتایی یەکانی مۆرینۆ لەگەڵ شانۆی دەروونی و شانۆی سەرپێی دەستی پێ کردووە و زۆرترین پەیوەندیشی بە شێوەی شانۆگەریی ئاسایی یەوە هەبووە پێش ئەوەی ببێتە شانۆی چارەسەرکردن مۆرینۆ وای دەزانی بەڵکو باوەڕی وابوو کەوا کرداری شانۆیی بە شێوەی ئاسایی (التقليدي) وەك کردارێکی ئاراستەکراوە بەشێوەی ئامادەکردن و نووسینەوەی دەقەکانی لە چاکترین شێوەکانیدا دەبێتە کردارێکی ناخۆشەویست، خۆ لە ناشرینترین شێوەکانیشیدا دەبێتە کردارێکی مردو، لەمە لەگەرمانەوێ کردارە شانۆیەکە بە سەنگە داهێنەرییەکان هەڵ سەنگێنین بەم جۆرە مۆرینۆ سوورە لە بۆچوونە شانۆکەرییەکانی دەربارەی مەسەلەی پەیدابوونی شارەزایی لەکاتی نواندن دا (التمثيل) نواندنیش بەبێ بوونی شارەزایی فێرکراو (الملقنة) بنەرەتی شارەزایی زیندووەکان بەکردەوەی پرتوانین و بەرەوگۆڕین و دروستکردنی شێوەی گونجاندنی راستەقینە لە نێوان ئەکتەرەکە و دەروونی خۆیدا لە لایێکەوە، هەروەها لەنێوان ئەکتەرەکە و بینەردا لە لایێکی ترەوە.

بەم جۆرە مۆرینۆ سەیری شانۆی ئاسایی دەکا وەك سەیرکردنی شیکردنەوەی دەروونی ئاسایی هەرچەندە مۆرینۆ قوتابخانەکەی تایبەتە شیکردنەوە کەسایەتییەکانی پێوە دیارە، بەڵام لە لایێکی ترەوە وا دەردەکەوێ جیاوازیێکی هەیە لەگەڵ تایبەتەکانی قوتابخانەی شیکردنەوەی (فرۆید) لەڕووی باسکردنی بابەتی شیکردنەوەی کەسایەتیدا مۆرینۆ بە فرۆیدی وتووە:

«تۆ خەونەکانیان شی دەکەیتەوە، بەڵام من هەوڵ دەدەم هانیان بدەم جارێکی تر خەون ببیننەوە. من خەڵکی فێردەکەم چۆن لە توانبنیان دا بێ ببنە نیمچە خوداوەند!»

لە ڕاستیدا ڕێبازی شیکردنەوەی دەروونی بەپێی بینینی کەسایەتی لای فرۆید ڕێبازێکی پێشتری ڕێبازی شانۆی دەروونییە لەبواری مامەڵەت کردن دا لەگەڵ شێوەکانی نەخۆشییە دەروونییەکان دا لێرەدا جیاوازی هەیە لەگەڵ شانۆی دەروونی کەوا نەخۆشەکە لە حاڵەتی شیکردنەوەی دەروونی ئاسایی (فرویدی)عونسرێکی بزوێنەرنییە لە کاتێك دا نەخۆشەکە لەشانۆی دەروونی بەکردارێکی دیاری کراوەدا خەریك دەبێ ئەویش نواندنە کە یارمەتی دەدا بۆ ناساندنی زاتی خۆی و تەنگوچەڵمەکانی.

مۆرینۆ باوەڕی وایە ئەم (ئامرازێتی یە) مەسەلەی ناساندنی خۆ (self) ئاسانتر دەکا وەك لە ڕێبازی شیکردنەوەی دەروونی کە مەنگ و نەبزوێنە بەگوێرەی شانۆی دەروونی کە ناسراوە بە بزوێنەر.

هەروەها شانۆی دەروونی لە سنووری ئاشکراکردنی و دۆزینەوەی ڕووداوەکانی پێشوو بایەخدان پێیان ڕاوەستانیان بۆ نی یە، بەڵکو زیاتر بایەخ بە یارمەتیدانی نەخۆشەکە دەدا بە ڕێگای کرداری شانۆیی، بۆ ئەوەی بزانێ دوارۆژ چی ڕوودەدا یان لەوانەیە ڕووبدا، کەواتە بینینی دوارۆژ، بەمە هەڵی پێزانین و بینینی دوارۆژ و خۆ ئاراستنی نیسبی زیاتر جێگای ئیحتمالی نەخۆشەکەیە لەم ڕێیەوە. باشتر بڵێین ڕێبازی شانۆی دەروونی یارمەتی تاك دەدا نەك بۆ بینینی کەسایەتییەکەی وەك هەیەو بەس، بەڵکو چی بەسەر دێ و دەگاتە کوێ لە باری تازەیدا، کەواتە لەکاتی چاك بوونەوەیدا، لێرەدا وتەکەی مۆرینۆ دێتە دی کە لەمەوپێش باسمان کرد (هاندانی نەخۆشەکان بۆ ئەوەی جارێکی تر خەون ببینەوە.)

## کەسەکانی شانۆی دەروونی:

### یەکەم: بەڕێوەبەری چارەسەرکەر:

### بەڕێوەبەری چارەسەرکەر لە شوێن

دەرهێنەر، شانۆکە بەڕێوە دەبا و سەرپەرشتی ی چارەسەرکردن دەکا و یارمەتی نەخۆشەکە دەدا لە قورتاربوونی لە تەنگوچەڵەمەییەکانی و.

بەشداریی دیاریکردنی گیروگرفتەکە دەکا، کە بۆ نواندنەکە ئامادەی دەکا. هەروەها ئەکتەرەکانی تریش هەڵ دەبژێرێ و جارنەجارێکیش یارمەتییان دەدا لە وتووێژ و نواندن دا بۆ ئەوەی نەپچڕدرێ، هەروەها بەشداریی دووانەکان دەبێ کە دوای

هەر پارچەیێکی نواندنەکە دێ. مۆرینۆ دەوری بەڕێوەبەری چارەسەرکەرەکە لە شانۆی دەروونی‌دا بە سێ وەزیفەی گرنگ دیاری دەکا:

دەوری وەك دەرهێنەر، دەوری وەك کاری چارەسەرکەر، دەوری وەك تێبینەری شیکردنەوەیی. دەرهێنەرەکە لەبەر ئەوەی هەڵوێستی شانۆیی ڕێك دەخا، ئەرکی خستنەگەڕ و خۆگەرم کردنەوەی ئەندامەکانی کۆمەڵەکەی دەبینێ، لەگەڵ هەڵسانی بە دروستکردنی حاڵەتی بەردەوام بوون لێك نەپچڕاندنی حاڵەتی (درامی). هەروەها هۆی کاری چارەسەرکردنە لەبەر ئەوەی یارمەتی نەخۆشەکە دەدا لەسەر ڕێکخستن و پەرەپێدانی حاڵەتی شانۆگەرێتی لای نەخۆشەکە (دیمەنەکە) هانی دەدا بەرەو بەرەڵالی و دروستکردن و پاك بوونەوە و پەیداکردنی شارەزایی پەیدا بکا لە ئەنجامی نواندن دا. دەمەتەقێ کردنی نەخۆشەکە دوای ئەنجامدانی (دیمەنەکە) دەورێکی گرنگ دەبینێ لە چارەسەرکردنەکە. بەڵام دەوری چارەسەر کەرەکە وەك تێبینەر لەوانەیە لە ئەنجامی تێبینی‌یەکانی هەڵوێستە گشتی‌یەکە ڕەچاو بکرێ:

نەخۆشەکە و یاریدەدەرە ئەکتەرەکان و بینەرە نەخۆشەکان و، تا چ ڕادەیێك سوودیان وەرگرتبێ لە (دیمەنەکە):

دووەم: نەخۆشەکان:

ئەم نەخۆشانە ئەکتەرەکانن، هەروەها بینەرەکانیشن، لەوانەیە نەخۆشێك یان لە نەخۆشێ زیاتر لەسەر شانۆکە ببینین لەوانەشە (دیمەنەکە) پەیوەندی هەبێ بە هەندێ لە بینەرەکانەوە، وەیان دەوری ئەوانی تر و چاوەڕوانی دەورەکانی خۆیان بکەن تا کاتی هاتنیان، بوونیانیش وەك بینەر یارمەتییان دەدا بۆ ئەوەی لەگەڵ وەزعی شانۆکە بگونجێن بۆ ئەوەی دوو دڵ و شەرم کردنەکانیان کەمتر ببێتەوە و بڕەوێتەوە بۆ ئەوەی ئامادەی بەشداربوونی دەورەکانیان بن:

## سێیەم: یاریدەدەرەکان

لەمانە ئەو کۆمەڵە کەسانەن کە بە دەوری ئەو کەسانە هەڵ دەسن کە کاریان کردۆتە سەر ژیانی نەخۆشەکە (پاڵەوانی شانۆگەری‌یەکە) هەروەها دەوریان هەیە لە دروستکردنی بار و گیروگرفتەکە، وەك باوك یان دایك یان مێرد و ژن لەگەڵ خاوەندکار... هتد.

### نەخۆشە پاڵەوانەکە:

شانۆی دەروونی شێوازەکانی زۆرن، ئێمە دەست دەکەین بە شێوازی باو و پاشان باس هەندێ شێوازی تایبەت دەکەین لەم بوارەدا دەربارەی چارەرکردنی دەروونی

کاتێ کە پاڵەوانەکە هەڵ دەبژێردرێ، ئەویش پاڵەوانی شانۆگەری‌یەکەیە و یەکێ لە نەخۆشەکانیشە، بۆ ئەوەی دیمەنەکە پێشکەش بکا، ئەم دیمەنە دەبێتە بەردی بناغە یان بنەڕەتی (بیناکاری) شانۆگەری‌یەکە، شتێکی ئاسایی‌یە کە چەند کەسێك بەشدار بن لە پێشکەش کردنی دیمەنەکە و خۆیانیش بە یەکتری بناسێنن و ڕابوردوویان و پاشینەکانیان (خلفیاتهم) جۆری ئێش و ئازاریانیش ئاشکرا دەبێ، دوای ئەمە دیمەنەکە دەس بە(ارتجالی) دەست پێ دەکا.

لە کۆمەڵە تازەکان دا یان لەو دیمەنانەی کە پێویستی‌یان بە کات و ماوەیێکی دوورودرێژ نی‌یە یان بە گواستنەوەی زۆر و درێژخایان، پاڵەوانە نەخۆشەکە پێویستە هەندێ شت ئامادە بکا بۆ دیمەنەکە، وەك پێشکەش کردنی هەندێ زانیاری دەربارەی خۆی و جۆری بەسەرهاتەکانی هەروەها دەربارەی کەسەکانی تریش کە دەوریان هەیە لە پەیداکردن و دروستکردنی بە سەرهاتەکان و ناخۆشی‌یەکان. نەخۆشەکە بەشداری دەکا لە ڕێك خستنی شانۆکە، ئەم بەشداربوونەش یارمەتی نەخۆشەکە دەدا کە بگونجێ لەگەڵ هەڵوێستەکە و لەگەڵی‌دا بژێ، هەروەها نەخۆشەکە پێویستە بە یارمەتی دەرهێنەرە چارەسەرکەرەکەی ئەو کەسانەی لە دیمەنەکە بەشداردەبن و یاریدەدەری هەڵیان بژێرێ، کەواتە ئەو کەسانە دەوری جۆراوجۆر پێشکەش دەکەن کە پەیوەندی بە نەخۆشەکە و گیروگرفتەکانی یەوە هەیە، دوای ئەمە دەبێ نەخۆشەکە بۆ ئەم کەسانە دەورەکانیان ڕاڤە بکاکە پێ‌ی هەڵ دەسن. ئەم تەعلیماتانەی کە نەخۆشەکە دەیدا بە یاریدەدەرەکانی دەبنە هۆی تێگەیشتنی گیروگرفتەکە و نیزیك بوونەوە لەواقعی ژیانی ڕۆژانەی خاوەند گیروگرفتەکە، کەواتە پێویستە لەسەر نەخۆشەکە، دەوری ڕاستەقینەی خۆی لە دیمەنەکە ڕوون بکاتەوە، هەندێ جاریش ناچاردەبێ بە کورتی دەوری کەسێتی‌یا یەکەی بەرامبەری ببینێ بەبەرچاوی ئەم یاریدەرانەوە، ئەو کەسێتی یەی کەبۆتە هۆی

(موعاناتەكەی)بۆ ئەوەی هزرێكی ڕاستەقینە بداتە دەستەوە دەربارەی دەورەكەیان ئەودەورانەی پێ ی هەڵ دەسن . بۆ نموونە لەوانە ناچاربێ لاسایی ژنەكەی بكاتەوە كەچۆن قسەی لەگەڵ دادەكا ، بۆئەوەی ئەكتەرەیاریدەدەركە لەدیمەنەكە بتوانێ دەوری كەسایەتی ژنەكەی ببینێ وزیاتر واقعی ژیانی نەخۆشەكە نیزیك ببێتەوە .

دەتوانرێ لە كۆتایی دیمەنەكە(المشهد)داوالە نەخۆشەكەبكرێ دووپاتی دیمەنەكە بكاتەوە كەواتە سەرلە لەنوێ بەدەورەكەی هەڵ بسێتەوەبە هەمان شێوەكانی خۆی لەگەڵ سووربوون لەسەر ئەو پارچانەی كەچاركەرەكە (المعالج)بە گرنگی دەزانێ وبۆتە هۆی گیروگرفتەكەیان دەبێتە هۆی چارەسەركردنەكە ، هەروەها دەتوانرێ داواله نەخۆشەكە بكرێ ، لەكاتی دووپات كردنەوەی دیمەنەكە ، وازلە دەورەكەی بهێنێ بۆیەكێكی تر ، بۆئەوەی بە خۆی ببینێ وبزانێ ئایا دەتوانی ڕەوشتەكەی بگۆڕێ ، یان ئەو لایەنانەی پێیان ڕازی نابێ ودەست درێژ پیان بۆ دەكاتە ، كە چارەسەركەرەكە سوورە لەسەریان .

مەسەلەی دووپات كردنەوەی دیمەنەكە دەورێكی گرنگە دەبینێ لەچارەسەركردن ، لەبەر ئەوەی چاركەرەكە «سەرپەشتی كەری شانۆكە »دەتوانێ لەكتەرەكە ڕابگرێ ودەمەتەقێ ی لەگەڵ دابكاوپاشان ئاراستەی بكا . دوای تەواوبوونی دیمەنەكە چاركەرەكەبە تواناتر دەبێ وزالتردەبێ بەسەر پاڵەوانە نەخۆشەكەدا ، هەروەها نەخۆشەكەش بە دەوری خۆی لە جاران زیاتر قایل دەبێ بە چارەسەركردنەكەی ودووپاتكردنەوەی كە (التمثیل)بە گیانێكی نوێ ترەوە ،بەلام وەك باسمان كرد ، بەبێ ئەوەی دەقێكی نووسراوهەبێ ، بەلكوبەڕێگا هەوڵدانەكان بۆ ئاشكرادنی خۆو(الذات)سەرلەنوێ بەرەڵلاكردنەوەی بە ڕێگادیمەنە دووپاتكراوەكەوە

سەرەڕای ئەم شێوەیە باوەی كە باسمان كردلە ڕێبازی بەشداربوونی نەخۆشەكە لە شانۆی چارەسەركردنی دەروونی psychodrama شێوەی لاوەكی تریش هەیەوەك باسمان كردووە كەچارەسەركەرەكە دەتوانێ بەكاریان بهێنێ لەشانۆی چارەسەركردنی دەروونی داوەك :

***دەوری وەرچەرخاو:**

مەبەست لەوەیە نەخۆشەكە دەوری یەكێ لەتاكەكانی خێزانەكەی ببینێ ئەكتەرێكی تریش بەدەوری كەسایەتی نەخۆشەكە هەڵ بسێ ، وارێك دەكەوێ لەجۆری لەجۆرەكانی چارەسەركردنی خێزانێتی مێردەكە بەدەوری ژنەكەی هەڵ بسێ ، مەبەسلەم شێوەیە دانانی نەخۆشەكەیە بۆماوەییكی كاتی لە شوێن كەسەكەی بەرامبەر، بۆئەوەی بە شێوەیێكی بەرەڵلایی لەكاتی نواندنی دەورەكە هەست بەوەی بەرامبەری بكا هەروەها بۆئەوەی خۆی بەروونی ببینێ بەپێ ی بینینی بەرامبەرەكەی نەك بەڕێگای ئامۆژگاری یەوە بەڵكوبە ڕێگای خۆبوژاندنەوەی خۆی .

***ئاوێنە**

ئەم ڕێبازە بەكار دەهێنرێ كاتێ كە چاركەرەكە دەبینێ نەخۆشەكە توانای نی یە بە دەورەكەی هەڵ بسێ یان هەر ئامادە نی یە بەهەڵسانی . شێوەی (ئاوێنە) جیاوازییكی زۆری نی یە لەگەڵ دەوری وەرچەرخاو. ئەم ڕێبازەش یارمەتی نەخۆشەكە دەدا خۆی ببینێ بەلام لەشانۆگەری یەكە بەشدارنابێ وەك ئەكتەرێك بەڵكودەبێتە یەكێ لەبینەرەكان ولەنێوانیان دا دادەنیشێ بۆئەوەی خۆی لەسەر شانۆكە ببینێ هەربۆیە ئەم ڕێبازە ناونرا بە ئاوێنە .

*** نزاكردن : (المناجاة)**

دەتوانین بەپێ ی ئەم زاراوەیەواتێ بگەین كەنەخۆشەكە چی دەكا ، لەڕێبازی نزاكردن ، نەخۆشەكە یەكسەرڕووی دەمی دەكاتە بینەران بەشێوەیێكی بەرەڵلای و هەستەكانی بەرەڵلا دەكاو كەوانە تێروانینی (استبطان)حاڵەتەكە ئەم دەورەش بە دەورەكانی نزاكردنەكان دەكا لە درامای ئاسایی دا . بریتی یەلە (منولۆج)وەهەرچەندە هەندێ جیاوازی هەیەلەگەڵ منولۆجی ئاسایی ، لەبەر ئەوەی ڕێبازی نزاكردن لەشانۆی دەروونی بریتی یەلە دیمەنەكانی دەربڕینی بەرەڵلای سۆزی چارەكەری دەروونی ئەم ڕێبازە هەڵ دەبژێری كاتێ كە نەخۆشەكە توانینی نواندنی دیمەنەكەی نەبێ ونەتوانێ لەگەڵكەسەكانی تربچێتە ناوشانۆگەری یەكەوە ، بۆیە داوای لێ دەكرێ نزای ئامادەبووەكان بكا بەوانەی هەستیان پێ دەكا

یانْ کەچارکە دەبینیْ سروشتی گیروگرفتەکە ناخریْتە سەر شانۆوە.

## دوکانی سیحری (الدکان السحری):

ئەم ریْبازە بەکار دەهیْنریْو سوودبەخش دەبیْ، کاتیْ کە نەخۆشەکە لای روون نی‌یە یان دوود لە لە رووی ئارەزووە راستەقینەکانی بەرامبەر بە شتەکان و ئامانجەکانی لەژ یان دا روون نیین. کەواتە ئەو کاتەی نازانیْ چی دەویْ. لەم شیْوەیەی شانۆی دەروونی چارەکەرەکە بە دەوری فرۆشیار هەلْ دەسیْ، لەوانەیە یەکیْکی تر لە بینەرەکان بەم دەورە هەلْ بسیْو لەژیْر چاوەدیْری چارەکەرەکە. بەلاّم فرۆشیارەکە لیْرەدا شتومەك نافرۆشیْ وەك ئەو دوکاندارانەی لە دوکانەکانیان شت دەفرۆشن، بەلْکو (بەهاکان) دەفرۆشیْ لەگەلْ سیفەتە جۆراوجۆرەکانی کەسایەتی و بریتی یەکانی، ئەم شیْوەیە زۆر بە دیدەنی و چاوپیْکەوتنەکان دەکا، بەلاّم چاوپیْکەوتنیْکی والاّکراو بەرامبەر بە بینەران. چارەسەرکەرەکە ئەو شتە پیْویستی یانەی دەروونی لە دوکانەی‌دا دەخاتە بەرچاو نەخۆشەکەو بزانیْ چی‌یان سەرنجی رادەکیْشن و لیْ‌ی‌دەکریْو پیْویستی یەکانی ئەنجام دەدا. وەزعەکە هەستکردنْ بە ئیسراحەت و ئازادی هەلْبژاردن دەداو ئاشکراکردنی پیْویستی یە دەروونی یەکان بەرامبەر بە خەلْکی والاّدەکاتەوەو دەبیْتە هۆی چارەسەرکرنی دەروونی.

## گەرم کردنەوەو هاندان:

لەبەر ئەوەی سەرپیْ‌یی بایەخیْکی تایبەتی هەیە لەشارەزای‌یەکانی شانۆی چارەسەرکردنی دەروونی. (مۆرینۆ) سوورە لەسەر دەوری ماوەی گەرم کردنەوەو هاندانی نەخۆشەکە بۆ ئەوەی لە رووی دەروونی یەوە ئامادە بیْ بۆ بەشداربوونی لە شانوگەری‌یەکە.

مۆرینۆ سوورە لەسەر مەسەلەی توانینی دروستکردنی وروژاندن و ئارەزووی چارەسەرکردن بە ریْگای شانۆی چارەسەرکردنی دەروونی یەوە، هەروەها وا دەبینیْ (نەبرەییکی) سۆزیی کاردەکاتە سەر نەخۆشەکە بە ریْگای شانۆی چارەسەردکرنی دەروونی یەوە. هەروەها هەموو ئەو شتانەی خۆشی دەبەخشن دەوری خۆیان دەبینن لە رەوانەوەی شەرم و هاندانی نەخۆشەکە بۆ بەشداربوونی شانوگەری‌یەکە. (ئەجوای) نوکتەو گالْتەوگەپ، ئاشکرای کردووە کەوا دەتوانریْ بەکار بهیْنریْ لە کرداری گەرم کردنەوەو هاندان پیْش دەستەپیْکردنی (سایکۆدراماکە).

کۆمەلْیْ کرداری تر هەیە دەتوانریْ ئەنجام بدریْن پیْش دەست پیْکردنی چارەسەرکردنی (سایکۆدرامایی) کە یارمەتی گەرم کردنەوەو هاندان دەدەن، وەك ئەوەی داوا کەسە بکریْ کە چاردەکریْ یەکیْ لە بینەران هەلْبژیریْ کە هەست دەکا بە مەیلی بەرامبەری‌و داوای لیْ بکا کە وەسفی هەستەکانی بکا بۆی لەگەلْ کاردانەوەکانی بەرامبەری. لە کردارەکانی گەرم کردنەوەکە هەلْسانی نەخۆشەکەیە لەگەلْ یەکیْکی تردا بە هەولْدانە دەربرینەکان بەبیْ بەکار هیْنانی وشەکان، بەلْکو تەنها بەریْگای ئامـاژەکانەوە، هەروەها دەتوانریْ شیْوەی قسەکردنی گشتی بەکار بهیْنریْ کەواتە یاریدەدانی نەخۆشەکە بۆ ئەوەی بەکەیفی خۆی لەگەلْ بینەران قسە بکا.

دەوری چارەکەری کەسەرپەرشی سەر شانوگەری‌یەکە دەکا بایەخیْکی تایبەتی خۆی هەیەلە گەرمکردنەوەکە. لە پیْویستی یەکانی سەر ئەستۆی ئەوەیە هەست بە دلْ نیایی تەواوبکاو بەرەلْلای‌یەکەی‌و توانینەکانی بەکار بهیْنیْ بۆ دروستکردن و داهیْنان پیْویستیشە چارکەرەکە پیْشەکی پالْەوانی شانوگەرییەکەی دەست نیشان کردبیْ (نەخۆشەکە)بەلاّم هەنەیْ جاران دەتوانریْ پالْەوانی شانوگەرییەکە دوای گەرم کردنەوە گشتی یەکەی نەخۆشەکان هەلْ بژیردریْنی

## شانۆ:

شانۆ، لە شانۆی چارەسەکردنی دەروونی دەبیْ لە هۆلْیْکی بچووك ئامادەبکریْ بۆ بینەران و گوێگران، لە هۆلْەکە چاومان بە کۆمەلْیْ کورسی شانۆکە دەکەویْ بە بیْ بوونی پەردەی تایبەتی بەشانۆ تەختەی شانۆکەش دەکەویْتە بەردەم کورسی یەکانی ریزی یەکەمی بینەرانەوە.

شانۆ ، له بنەرەت دا بریتی یه لەسێ بازنەی تێك هەڵكێشراو و، پانـاییـەكانیان ، ئەو بازنانەی لەپێشەوەن پانترەبن لەوانەی دواوە، بازنــەكــەی ناوەنــدیش پانتــر دەبێ له بازنــەكــەی سەروتـرەوە، بەم پێ یه شانۆكه سێ ئاستی بەرزایەتی پەیژەیی (متـدرج)دەبێ و به جیـاوازبـوونی پانتـاییان . دیمەنی شانۆكه نزیكـه له دیمـەنی كێكی جەژنی له دایـك بوون . هەرووەهـا دەتـوانیـن هەنـدێ ئامـرازی رووناكردنەوەی ساده ببینین بەقەد دیـواری بەرامبـەر شانۆكەوە، مەسەلەی دیكۆریش ، دیكۆری شـانۆگەری یەكه مەسەلەیێكی نەگۆرەو زۆر بایەخی پێ نادرێ لەبەر ئەوەی ئامانجی شانۆی چارەسەركردنی دەروونی جیاوازە لەگـەڵ ئامـانجی شانـۆی ئاسـایی كه ئامـانجـەكەی (كەواته شانـۆی ئاسـایی )بینـەرانن بۆیـه دیكـۆرەكـه لێـرەدا دەرهێنەر بەكــاری دێنێ وەك كردارێكی وەزیفی (متفــاعــل)لـەگـەڵ رووداوەكـانی شانـۆگـەری یـەكـەو خزمـەتی ئەكتەرەكه دەكا . كەواتـه له (سـایكـۆدرامـادا)دانشتـوانیش نوێنـەری كۆمـەڵـه گەورەكـەن كه نۆخـۆشەكەی دەیەوێ ئەوراقەكانی بەرامبەریان كەشف بكـاو خۆی رزگـار بكـالـه ئازارەكـانی و تاوانـەكـانی و بەرامبــەریـان جاری ئارەزووكـانی بداو بریـاری سەرلـەنـوێ دروستكردنەوەی خۆی بدا (الذات)كەواته ئامادەبووان دەوری دیكـۆری راستـەقینەی شانۆگەری یەكه دەبینن كەواته پاشینەی كۆمەلایەتی یان ئەو كۆمەڵەی هەمیشه تاك دەیەوێ خۆی تیابنێتەوە .



سەرچاوەكان


1- BLatner H.A. psychodrama role . playing and action methods. thetford 1970

2- corsini .R.J. Methods of group psychodrama Mcgraw Hill New york 1968.

3- Moreno .J.I. psychodrama Vol 1 Beacon U.S.A 1964

4- Whos Who in America, 1966. Vol. 34. 1966- 67 chicago.

5-Moteno A survey of psycho dramatic techniques group psychotherapy 1959

6- Adams H Advances in Ex perimental clinical psychology 1971.U.S.A.

7- Wolman B. Handbook of clinical psychology Me Graw Hill Book company New york

8- Goldenberg contemparary clinical psychology california .

# بازنەی ژانی شکۆدار لە کۆردەرەدا

ڕەئوف حەسەن

زۆر ڕۆمــان هەن . . بەژەمــێــك و بێ دەســت لێ بــەردان تەواودەکرێن . . زۆریشن ئەوانەی بێزارمان دەکەن و بە هەناسە برکێ و پچڕپچڕ دەیانخوێنینەوە . .

لەوانـــەیـــە ئەم دوو حالـەتـە . . لە ڕوویێکـەوە پێـوەنـدی بەکـەسـێـتی خوێنـــەرەوە هەبێت . . وەك سەلیقــەو جۆری چێــژ وەرگـــرتنی ئەدەبی و ئاستی ڕۆشنبیـــری و هونـــەری . . هەروەهـا جۆری پەروەردەبـوونیش . . بەڵام ئەمـە بە هەمـوو لقـەکـانییـەوە نابێتـە هۆی سەرەکی و بەســەر هەمـوو ڕۆمانێکدا ناســەلمێنــرێت . . چونکــە لەو براویــەدام هۆی بنـەرەتی و سەراپـاگیـری لە هەردوو حالـەتـەکـەدا پایـەنـدی ڕاستگـۆیی هونـەری و هەستی مێـژوویی نووســەرە . . هەرئەمەیشە وات لێ دەکـات قارەمـانـانی ڕۆمـانـەکـە بەزیندوویی و چالاکانە لە گەڵتدا بژین . . یان خۆت تێکەڵاو بە ڕووداوەکانیان بکەیت و لە نزیکـەوە گوێت لە هەنـاسەو چرپەیان بێت و ڕوخسـاریان لە ڕەفتاریاندا ببینیت و . . بەپێچەوانەیشەوە . .

لەتـەك کارەسات و هەناسەساردی و ملهوڕێتی و زەبرۆزەنگ نوانـدن و گشت قارەمـانـەکـانی ڕۆمانی (کۆردەرە)ی خوسرەو جافی دەست وخـــامـــە ڕەنگینـدا نزیکـەی هەشت سەعـاتی سەروەڕ و بێ دەست لێ بـەردان ژیام . . دوای خوێندنەوەشی . . پێکـەوە ژیـان و هۆگـربـوونەکەم نەقرتا . . لەتەك زۆربەی قارەمــان و گەلێـك ڕووداویشـیـدا هەردەژیم و بۆن و بەرامـەو کەش و هەوای لام زینـدووە . . وا هەست دەکـەم زۆربـەیان ناسیـاوو کەس وکـارو هاوڕێمن . . بە خاس و خراپیانەوە . . بەهەست و نەستیانەوە . . پێم نامۆ نین و لە بەرچاومن . .

ئەمـانـە لە ڕۆمـانـدا . . لە هونەری ڕۆماننووسیندا ئەگەر بە سەرجـــەمی هونـەرەکـە دانـەنـرێن . . ئەوا بنـەمـاو کۆڵـەکـە پتـەوەکانی کارەکەن . . چونکە هەر ئەو ڕاستگۆییە هونەرییەیە ڕۆمانەکە لە چەقین و سرومت بوونەوە بەرەوزیندوێتی ژیان دەبات .

نازانم چۆن (دالگـە)م لەبیـر بچێتـەوە . . تۆبڵێی دالگـە هەر بەتەنێ دایکی ئەکبەرو زەمان ورەزاو زەهرا بێت؟! هەرگیز بروا ناکـەم . . بەڵکـو دایکی ڕاستەقینەی گشت بێ چارەو هەناسە ساردو خێـر لە خۆنەدیـوانی ئەم مەڵبـەنـدەیـە دایکی ڕەسەنی هەموو ئەوانەیە کە بە دەگمەن زەردەخەنە میوانداریی لێوانیان دەکات . .

**[هـەمــوومــان پێــدەکـەنین . . دالگـە چەنـد شیـرین پێدەکـەنی!! زۆرم لا خۆش بوو دالگـە پێبکـەنێت . . دیارە ئەگــەر دالگـــە وا کۆڵـەواری برسێتی و هەژاری و دەردەداری نەبێت . . ئەوا دەزانێت . . پێبکەنێت . . ل٤٢]**

دالگـە . . نەخـۆشی سووکەلەو نازپێوەکردنی نییە . . دەردی دالگـە مەگـەر زۆر گران بێت ئەمجـا پێی دەزانـرێت . . ئەوەتا بەجـــۆرێـــك لە پەل وپــۆ کەوتــووە . . کە تارمـایی مەرگ بە بەرچاوی منداڵەکانەوەو بەسەریێوە دێت و دەچێت . .

**[ئەم دەتوانی مردنی دالگە بەخۆم بسەلمێنم . . ئاخر چۆن باوەڕ بکەم دالگە بمرێت . . ئەی کێ جلی خەلکی بشوات!؟ کێ کلاش بۆ خەلکی بچنێت !؟کێ لە باوکمان بلاڵێتەوە تا کەوشی لاستیکمان بۆ بکرێت . . کێ هەمیشە خەمەکانی لەخوێدا پەنگ بخواتەوەو مولگەی تەواوی پەژارەکان بێت؟ . . ل ٦٩].**

خوسرەو جافی مۆنۆپۆلی خەم و سەرگەردانی لە ڕۆمانەکەیدا . . . هەردەم نەفس بەرزی و شکۆداری بەبالای خەمەکان بریوەو لێکی دانەبریون . . ئەمەش لە ئەدەبەکەماندا ئەدگارێکی ڕەسەنی نەتەوایەتی و چینایەتیمانە پێکەوە . . قارەمانانی قالبووی ئەشکەنجەو ئازار . . بە بالای بەرزو سەری بەرزییانەوە . . بەرەنگاری سەبەبکارانیان دەوەستنەوە . . گشت ژانەکان لە پریاسکە دەنێن و دەیکەنە توێشووی کاروانی تێکۆشان و بەرزەفریی داهاتوویان . .

[من لە سکی دالگەشدا پێشێل کراوم . . چیمە لە ئارەزووی بەرزەفری! ل ٦٠]

ئەم ئارەزووە شکۆمەندە . . دەبێتە بیروباوەڕێکی ڕەسەن و نەخشەی پراکتیکێکی بە زەبر بۆ دانانی سنوورێک بۆ سڕینەوەی سەرجەمی نامروەتییەکان . .

[من تا دوا هەناسەم و تا ئەودەمەی دەمێنم . . زیرەی بە نەك پچڕینی (زەمانی برام) لەبیر ناکەم . . ئەوزیرە بێ هاوارە پڕ دەردەدارییە خولیای مێشکمە . . وەك زەنگی کاروانێکی تالان کراو لە گوێمدا دەزرنگێتەوە . . . ل/٥٠]

کۆلەواری و داماوی لەژیانداو بەتایبەتی لە [تۆلەفرۆش]ی [کۆردەرە]دا . . بەجۆرێك سەر لە خەلکی دەشێوێنن کە دۆزینەوە سەبەبکاری سەزەکی کارێکی ئاسان نەبێت . . سەرەتا دەبینین نووسەری ڕۆمان بە وردی وێنەو ڕووداوەکانی ئاو بارە شلەژاوەمان دەخاتە بەرچاو . .
باوك بەرامبەر دایك (دالگە) دلڕەق و بە زەبرو زەنگە . . کە لە داخی دلی خۆی و لە ئەنجامی بێدەسەلاتی و بێ کاریدا . . پەتپەتی بە دالگە دەکات . .

**[دەنگی قوولەی شەمەندەفەر دەهات . . لە دوورەوە قوولەقوولەکەی لە هاواری (دالگە)ی دەکرد لە کاتێکدا باوکم بە پرچ ڕایدەکێشا . . ل/٥١]**

لەولایشەوە (نۆبەدار)ی لەمەڕ خاوەن مالێ . . کە ئەویش لە تاو نەبوونی لە هۆدەیێکی ئەو خانووەدا دەژی و دەبێت لەبری کرێی هۆدەکەی خۆی . . بە تۆپزی کرێ لە کرێچییەکانی دیبسێنێت . . ئەمیش دەبێتە ملۆزم بەسەر باوکەوەو تەنگی پێ هەلدەچنێت و . . نازانێت چۆن خۆیی لێ تەرەبکات.

کلیلداری خانەکەش کە ئافرەتێکی دەلەدێوە بیچمە . . لە مندالەکان دەبێتە شملی شەڕو . . لەسەر شتی زۆر هیچ وپووچ دەیان تۆقێنێت و زووخاویان بە گەروودا دەکات . .

ئەوە [حاجی سەعیدی] خاوەن چێشتخانەکەیشە بەچەشنی هەژدیهای حەوت سەر حەیش بە (کەلایی هەیدەر) تال دەکات و دەبێتە مایەی نان بڕینی ئەمانەو گەلێکی دیکەیش . .

بەلام هەژدیهای حەوت سەری ڕاستەقینە ووردەووردە لەلای ڕۆلە جگەرسۆزو بە ئەمەکەکانی (تۆلەفرۆش) ئاشکرا دەبێت . .

سەرەتا . . زۆر بەسادەیی لە دایەلۆزێکی کەلایی حەیدەردا پەنجەی بۆ ڕادەکێشرێت . .

**[ئێوە وەك من ئنگلیزی براسەگ ناناسن . . دە سالی ڕەبەق چێشتکەریان بووم . . سالێك بە تۆمەتی دزی خستمیانە بەندیخانەوە . . ساوەللا حەزرەتی یووسف چەندە بێتاوانە بوو منیش هەروەها . . ل٥٥]**

ئەم قارەمانە . . لە کاروکاسپی ناوبازاریش دەکرێت و دەبێتە کرێکار . .

[بەو دەستە پڕ لە محەبەت خۆشەویستی و میهرەبانییەوە کە لە

جیـاتی تریت وکەللەپـاچەی جاران . . قوری بۆکرێکـاران تێدەکرد . . ل/٥٩]

دوای ئەمـەو لاپـەڕەکـانی داهـاتوودا . . شارەزایانە پەنجە دەخـرێتـە بان برینـەکـەو کێشـەکـە یێـك لایی دەبێتـەوە . . داگیـرکـەرانی بێگـانـەو خۆفـرۆش و نۆکـەرانی ناوخـۆلەولاوە بەهـەمـوو زەبـروزەنگێگیـانـەوە دەوەستن . . دام ودەزگـای تایبـەتی ئەوسای میریش بە دڵ و بەگیان لە پێناوی بەرژەوەندی داگیـرکەران وخۆیاندا دەکەونە پەلاماردان ونهێن گری . . ئیتر هەر پیـلان و داپڵۆسین وچەوساندنەوەو دووبەرەکی نانەوەو لە خشتـەبردنی جۆراوجۆری ئاشکراو نهێنە . . بەرامبەر خەڵکی لە کاردایە

لەم لایـشـەوە . . بەرەی خێـر لە خۆنـەدیـو . . ئەوانـەی [لـەرەشبـەڵـەکی دەردو خەم و نەخـۆشی و برسێتیـدا ئاهەنگی ڕۆرۆ دەگێرن . . ل/٦٠] لە پەلە قاژ ی وشپرزەیی قوتاربوون . . . . دەستـیـان داوەتـە خەبـاتی نهێنی ویێـك خستنی ریزەکانیان . . هیواو ئاواتی گەورە لەتەك خۆیاندا کێش دەکەن . . لە تاڵی چێشتن و خۆراگـرتـنـدان . . لەنـووچـدان و هەستـانـەوەدان . . باکیـان لە تاڵ وسـوێـری نییە . . چونکە گوڵی هیوایان پێیە . . ئەو گوڵەی بەفرمێسکی چاوو هەناسەی سارد پەروەردەیان کردووە . . لە مێژەوە . . لە منداڵییەوە . . لە هەنـاویاندا گۆشیان کردووە . . چۆن گوڵاڵە سوورەی کەژان و دامێنـان خۆرسکـانـە هەڵـدەدەن . . لای ئەکبـەری قارەمانی [کۆردەرە] هەروا بووە . . کاتێك [عەباس]ی منداڵ پێی دەڵێت:

**[دەڕۆین دارگـوڵ دێنین . . لەگـەڵمـاندا نایەیت؟ ئەکبەر لە وەڵامدا دەڵێت:**

**ـ هەستـە با بڕۆین . . تا دیسـان گوڵی سوور بهێنین و بیان چێنین . . قەیناکا هەڵیشی‌کێشن . ل/٢٨]**

هەر ئەم قارەمـانە . . کاتێك گوزەرنامەی بە ناوێکی دیکەوە بۆ دەکەن و دەبینێت وێنەی خۆیی پێوەیەو ناوی بۆتە ڕەشید . . دەڵێت:

[هـەستـم بە هیـچ بوون کرد . . ل١٧٣] ئەم هەستـە کت وپـڕو ڕاستـەقینـەیـەو بەم سێ چـوار ووشـەیەوە . . مانای گەورەتـر بە دەستـەوە دەدات . . گەرچی بە ناچـاری ناوی گۆڕاوەو کارێکی دڵسۆزانەشە لەتەکیدا کراوە . . بەڵام ئەکبەر خۆشی لێ نـایـەت . . چونکـە ناوەکـەی وکویـرەوەرییێکـانی پێکەوە ژیاون . . .

**[سـەرمـایـەم بیرەوەریم بوو . . ئازارەکانم . . دەردەکانم . . . . هتد ل/١٧٣]**

دەسا با ئەوانەی وا لە سەرگەردانی ئەم چینە گەیشتوون کە ئازارو چەوسـانـدنـەوەکانمان و بیروباوەڕمان لە هەندەرانەوە بە قاچـاخ هێنـاوەتـە ئەم مەڵبـەندە پاشگەز ببنەوەو بێن لە داوێنی [داڵگە]و گشت خێر لە خۆنەدیوەکانی [تۆڵەفرۆش]دا کرنووش بەرن . . با تێـفـکـرێـن و دان . بەو هەقـیـقـەتـەدا بنـێـن کەفـرمێسکمـان کوڵـۆنیـایی نییـەوە هەنـاسـەی ساردمـان لە سایبـریـاوە نەهێنـاوە . . بەڵکـو چەوسێنـەرەکـان ئنگلیـزو داگیرکەرانیانیان کردە دیاریی مۆتەکە ئاسابەسەرمانەوە . . هەر ئەوانیش پێشـوازییـان لێکـردن و بوونـە نۆکـەرییـان و . . بە خایـەومـایـەوە خێرو بێری نیشتمانیان خستە بەردەستیان . . . کامپ وئۆردوگاکانیان هێنایەسەر سنگمان . . تا نەیان دەگرتە بەرەنگـاربـوونـەوەو بێـزاری دەربرین لە دەستیان . . ئەوانیان کردە خانـەخـوێ و بە خزمـەتگـوزارییان نەك قایل بوون بەڵکە خۆشنوودیش . . بەڵام چی بکەین . . .

**[قـسـە بە زۆرانـدان ئاسـنـی سارد کوتـانـە . . بەڵام جارجـارێـك دەروونی مرۆڤ جۆش دەخـوات . . کەف دەکـات و سەردەدات . . بۆ دامرکاندنەوەی دەروون ئاسنی سارد کوتانیش هەر باشە . . ل/١٤٣]**

ناچـارین . . مرۆڤ ئەگـەر ئاسـانی ساردیش بە زەبـر بکـوتێت هەرشتێکی لێ پان دەکاتەوە . . یان هەر هیچ نەبێت دەنگ وسەدای خەڵکی هۆشیار دەکاتەوە . . گەرچی ئێمە بێگومانین:

[کـەم چاوبۆی هەیـە فرمێسکی خەڵکی ببینێت . . ئەگەر بەدیشی کات ئەوا خۆی لێ هەڵە دەکات وکەمتەرخەمە . . .

خۆ لێ هەڵەکردن وتانووت لێدانەکەشیان هەر لەوەوە هاتووە کە هەست بەنەنگی دەکەن . . جونکە چاك دەزانن کە رەفتارو بۆچوونی ئەوان بۆتە مایەی ئەوەی [بۆ ژەمێك نان گێرەی دەریا بکەین . . ل٢١٧]

خوسرەو جاف بەشێکی زۆری رۆمانەکەی بەوێنەی جوانی ئەدەبی هەست پێکراوو واقیعیانە رازاندوتەوە سەرەرای پێکچواندن [تشبیە]ی ورد . . زۆربەیان دەبێت لە بەردەمیدا رابمێنین وبە قووڵی لێیان وورد ببینەوە . . ئەمەش لە دەسەڵا هونەرییێکەی نووسەرەرە هاتووە . . خۆئەگەر ئەم وێنە ئەدەبییانەی تێدا نەبوایە ئەوا ستوونێکی گەوهەری رۆمانەکە لاسەنگ دەبوو . . سەرجەم دەبووە گێرانەوەییێکی سادە . . کە ئەوەیان لە دەست هەمووکەس دێت . . . هەر ئەمەیشە کاری ئەدەبی لە گێرانەوەی ساکارو ساویلکانە جیادەکاتەوە لە وێنەگرتنی دەریای سپی ناوەراستد دەڵێت :

**[ئەم دەریا ئارامە . . وا لە بەرچاوما لەشی چون ئافرەتێکی مەیزەدەو خومار راخستووە . . ل/١٩٩]**

لە دەربرینی هەست ورەفتاری [زەهرا]ی خوشکیدا کە دەیەوێت یاریی لەتەك ئەستێرەکاندا بکات . . ئەم تابلۆیەمان بۆ دەنەخشێنێت :

[زەهرای بچکۆلە پەنجەی لە ئەستێرە دەکوتاو نەدەهاتە چنگە بچکۆلەکانییەوە . . دەگریاو پێدەکەنی . . ل/٧٣]

لەکاتێکدا باوکی گوێی رادەکێشێت . . وێنەیێکی کاریکاتێرانەی ئازاراوی دەکێشێت :

[خەوم بە بازووی باوکدا هەڵواسی . . تازەبری گوێ راکێشانە کە کەمتر بێتەوە . . ل/٧٥]

ئەمجا بروا چۆن دیمەنێکی زوڵم وزۆرداری بۆنەخشاندووین

ئەگەر توانیم ئەوا تۆڵەی خۆمی لێدەکەمەوە . . نەشم توانی . . وەك هەزاران هەزار زوڵمی نارەوای بەرەوابوو ئەمەیش بە قەڵاندۆشکانمەوە دەبێت . . . ل/٩١]

پێکچواندنی دیمەنی درەختەکان لە وەرزی گەڵا رێزاندا و بەو شتەی کە لە سەرتاپای رۆمانەکەیدا مەبەستێتی کە هەژارانن . . . هاوسەنگی و وردەکارییێکی کارامانەیە . . تاهۆگربوونی خوێنەر لەگەڵ تەوەری کارە ئەدەبییێکەدا نەپچرێت و بەردەوام لەتەکیدا بێت :

درەختەکان وەك جل وبەرگی هەژاران شرۆڵ بوون . . ل/٩٤] شپرزەیی زیانیشیان بە تێکرا دەشوبهێنێت بە پەری بەردەم رەشەباو دەڵێت :

**[پەری مریشك ئاسا . . سووك و بابردەڵەیە . . ل/٩٤]**

کاتێك کە خۆی وباوکی بێ ناسنامەدەبینێت . . وا دەزانێت لە رەگ وریشەو نەژادەوە هەڵپچورکێنراوە . . بۆیە دەڵێت
[خۆم بە پەتاتەیێکی بێ رەگ وریشەو دەزانی . . . ل/١٠٩]
تەنانەت دەگاتە ئەوەی کە شکۆداری و نەفس بەرزێتیان لە وێنەی شتێکی بەرجەستەدایەو دەستکاری دەکەن . . بۆیێ پرسیارە پر لە مروەت و دەماخ بەرزییێکەی بەم شێوەیە دەردەبرێت :

[بۆچی دەبێت هەمیشە بۆ ئێمەی بەشخوراو هەموو شتێکمان و کارێکمان بە پێشێل کردنی غووروورو کەسایەتیمان بێت ! . . ل/٨٢]

نموونەی ئەم دیمەنانە زۆرن . . ئەمانە مشتێکی گچکەی خەرواریێك بوون . . تاکو فریای لایەنە جۆراوجۆرەکانی تر بکەوم . . بۆ خوێنەری جێدەهێڵم . .
خوسرەوجاف لەدەربرینی هەستی بێگەردی منداڵانەدا وەك کارامەیێك دێتە بەرەوەو . . بە جیهانی دەنگ ورەنگ و دەروونە خاوێنەکەیان ئاشنایە . .

[رەزا] لە براکەی دەپرسێت :

[- کەی ئێمە گەورە دەبین

- دەبێت خواردن زۆر بخۆین تا گەورە ببین . .

- ئەی هاوار . . کەواتە قەت گەورە نابین . . ل٤٢]

**[زەمان]ی برا گچکەیان خۆزگە دەخوازێت**

**[لەباتی باران شێلمی کوڵاو بیارێت . . ل/٦٢]**

که [دالگـه ] نەخـۆش دەکـەوێت . . [ئـەکبەر] خەمی ئەوەی لێـدێت [کێ لە باوکمـان بلاڵێتـەوە تا کەوشی لاستیکمـان بۆ بکرێت . . ل/٦٩]

لەم نموونانەیش زۆرن . . با بەهێندە لێی بگەڕێین و چەند تێبینی‌یێکی گشتی دەربارەی [کۆردەرە] بخەینە ڕوو . .

لەوانـەیـە هەنـدێـك لە ڕەخنـەگران نارەزایی سەربارەت بە شێوە جیاجیاکانی زمانەکەی خوسرەو جاف دەرببڕن . .

بەڵام من لەو بڕوایـەدام . . ئەو شێـوە جیـاجیـایـانـەی زۆر شارەزایانە دارشتووەو لە سنووری دایەلۆژەکان زێتر تێپەڕنەبووە . . ئەمـە خاڵێکی گەشی ڕۆمـانـە کەیـە کە سەرەڕای هەمـوو لایـەنـەکـانی دی ڕەسـەنێتی‌یێکی زێتـری پێـدەبەخشێت . . دایـەلـۆژەکـانی پاڵـەوانـانی پەروەردەو زادەی خانـەقین یان [تـۆڵـەفـرش] . . هەروەهـا دایەلۆژەکانی قارەمانێکی ناوچەی شارەزوو . . کارەکەی فراوان و پتەوو ڕەسەنتر کردووە.

بەڵام خاڵێکی بچـووك هەیـە کە نەك لەم ڕۆمـانـەی کاکـە خوسـرەودا بەدی دەکـرێت . . بەڵکـو لە شاکـارە جیهـانی یێکاندانیشدا کەم وزۆر هەیەو بە مەبەستی جیاجیا . . ئەویش بریتییـە لەو ڕووداوو لاپـەڕە زیـادانـەی کە ڕەش کراونـەتـەوەو پێـوەنـدی راستـەوخـۆتـەنـانـەت ناراستـەوخۆشیـان بەسـەر سەرتـاپـای مەبـەست و فیکـرو کرۆکی بابەتەکەوە نییە . . جا لەوانـەیـە هەنـدێـك جار بۆ تامو چێـژ ڕووداوێکی لابـەلایی بخـزێننـە ناوی . . یان ئەوەتـا شتێـك هەیەو . . وەك یادگارو بیـرەوەری بەلای ڕۆمـانـنـووسـەوە شوێـنێکی تایبـەتی بۆ تەرخان کردووەو بەلای خوێنەرەوە بایەخێکی ئەوتۆی نی یە . .

لەم ڕووداوە زیادە لەسکانە لە ڕۆمانی کۆردەرەدا گەرچی کەمن بەڵام هەن . . بەتـایبـەتی «هـەنـارە عاسی بـوۆکـەی گیرفانی چاکەتەکەی زەمان» . . هەروەها «کابرا کە بای لێبەربۆتەوە . .

بەڵام بەپێـچـەوانـەی ئەمـانـەوە . . کابـرای لەمـەڕ «مـوسیبەت نامە»و «بوونی نەنەو باپیرە» دەورێکی کاریگەریان لە خولقـانـدنی بارودۆخ و بیـرو ڕاو خوونـەرێتی پاشکـەوتەی مەڵبەندەکەوژ یانەکەدا کێراوە . .

ئەوی ڕاستـی بێـت من نازانـم کاك خوسـرەو جاف تا چ رادەوپلەیێك سوودی لە «دەروێشیان»ی ڕۆماننووس وەرگرتووە . . چونکـە هیچیم نەخوێندۆتەوە بەڵام هونەرمەندانە سوود لە «لێـرمەنتۆف»و ڕۆمانی «قارەمانێکی ئەم سەردەمە»ی وەرگیراوە . . ئەمـەیش تەنیـا وەك لایـەنێکی هونـەری لە خستنە ڕووی ڕووداوەکـانـدا . . چونکە «بیتچۆرین»ی لەمەڕ لێرمەنتۆف . . سەرەڕای ئەو ڕووداوانـەی سەربـارەی قارەمـانـەکـەی . . پەڕە کاغـەزەکانی دەست خەتی [بیتچۆرین]یش دەخاتە ڕوو . کە بەشێکی سەرەکی ڕۆمـانـەکـەیـەتی و . . لە ڕۆمانی دیکەشدا چەند جارێك شتی وام بەلادا تێپەڕیوە . . ئەمەیان بۆئێمە زۆر پێـویستـە . . سوود لە هەر هەمـوو هونـەرو تەکنیکی ڕۆمـانی جیهانی وەربگرین . . ئەمە نەکەین پیشەکە فێرنابین . . تەنیا هێنـدە هەیـە بابـەت و پاڵـەوانـەکـان ڕووداوەکـانمـان وەك [کـۆردەرە] لەسـەر خاك و مەڵبەندی خۆمان بێت و باروهەوای ئەم هەرێمەی هەڵمژ ی‌بێت و ئەندێشەی مرۆڤی کوردو داب و نەریتی هەوارەکـەمانی تێدا ڕەنگ بداتەوە . . کە لەم حالەتەدا دەبێتە ڕۆمانێکی ڕەسەنی خۆمان.

بە لامـەوە مایـەی سەرسـوڕمـان و خۆشنـوودی بوو کە لە دوالاپـەڕەکاندا بۆم ڕوون بۆوە گشت ئەو ڕووداوانەلە دەفتەری بیـرەوەری [ئەکبەر]دا نوسراونەتەوەو بەمەیش کەمێك لە زەبری ئەو ٤٠ـ٥٠ ساڵـەی(کـۆردەرە] دەیخـایەنێت ـ کە بەماوەیێکی دوورودرێـژ دادەنـرێت لە ڕۆمـانی سەردەمدا ـ کەم دەکاتەوەو دەیخـاتـە نێـو قاڵبێکی هونـەریی پەسـەنـدکـراوەوە . . کە شێـوەیێکی بازنـەیی وەردەگـرێت و جارێکی دی لە [ئەلوەندا] یان [ئـەلـوەنـد]و [شـەمـاڵ]و لە ئیسپـانیـاوە . . ڕووداوەکـان دەگـەڕێنـەوە هەوارو سەرلـەنـوێ دەست پێـدەکـاتـەوە . . تا دەگـاتەوە مەدریدو لە خول وگەڕان و چالاکی دا بە زیندوویی و بزێوی دەمێنێتەوە . .

# مانگەشەو رێبوارێکی غافڵ نیە..

● غفور صالح عبدالله ●

ئەو دەمـەی ئێمـە دەستمـان قەڵەمی گرت، لە پێش هەموو شتێکا خزمـــەتی ئەدەبی نەتـەوە مانمـان لەبـەرچـاو بوو، هەر زوویش فریای ئەوە کەوتین کە بزانین ئەدەب هێندە نێوەندێکی پاکـژ و پیـرۆزە، هەربـۆیـەش کە نیـازی بڵاوکردنەوە لەلامان چەکــەرەی دەرێنــا، وامــانــدەزانـی توخنی میحــرابی پە رستگـایـەکی هەرە پیـرۆز دەکـەوین و، بە دەیـان تاوتۆکردن و دڵـەراوکێوە ئەو نووسینـەمـان بۆ رۆژنـامـەیەك دەنارد، هەرکە دەشمان نارد زوو بە زوویی پە نجەی پە ژیوانیمان دەگەزت. بریـا نەمناردبایە، ئەوساش دەیان مامۆستای خۆمان لەبەرچاوو بوو، تەنـانـەت لە رێگاو بانیش دا بەرێزەوە قسەمان لەگەڵ ئەو مامـۆستـایـانەدا دەکرد، هەستمان دەکرد کەسانێکی پیرۆزن و دەبێ بە دەیان شایەتمان و ئەستەغفیرولڵاوە ئەگەر دەرفەتمانیش هەبووایە دەسنوێژمان دەگرت ئەوجا توخنیان دەکەوتین. بەڵام رۆژگـاری ئێستـای ئەدەبـەکـەشمـان وەکو دەیان رۆژگاریدی لێهاتووە، وەکو قسەیەکی نێوخەڵکی هەیە کە دەڵێ، گەورەو بچـووکی نەمـاوە، زانـاو نەزان لەیـەك جوداناکرێنەوە، پیاوی باش و پیــاوی قەڵب لەیــەك جودانـاکـرێنـە، کاری دیـزە بە دەرخـــۆنـــە کردن بووەتـــە یاســایـەکی هاوچـەرخـانـەی ئەم سەردەمـەمـان. یاخود ناوێری بە کەسێك ئەگەر بەهەقیش بێ بڵێی بەریچاوت کلیپێوەیە. یاخود رای خۆت سەبارەت بە هێنــدێ هەڵــەی بچــووکی کەسـان دەربـری، ئیـدی کفـر ئەحمەدیو کفرت کردوە. ئێمە هەموو دەشزانین کە بە رەخنەو رەخنـەگـرتن هەڵـەکـانمـان چارەسـەر دەکرێن، ئەم گرفتەش دەگـەرێتـەوە بۆ ئەوە کە هەمـوو خۆمـان بە مامۆستا دەزانین و، کەس قوتـــابی نیـــەو کەسیش بە قۆنـــاغی قوتـابیـەتیدا رەت نەبـووە. ئێمـە لێـرەدا لە تەوازووعـەوە ئەمـە ناڵێین کە تا ئێستا خۆمـان بە قوتـابی ئەم بوارە زانیـوە، ولە کارگەی ئەم پیشەیەدا شاگـردین، خۆشمـان بەرچـووکی هەموو گەورەو. بچووکێك دانـاوە چونکی لەگـەڵ هونـەرو کەلتووری نەتەوەکەمان خوای خۆمـان دا نیازمان پاکە ئەگەر سووژنیان لێ تێنەچەماندبم، دەرزیم بەکەس دا رۆنەکردوە. چونکی بۆمان روون بوەتەوە بە پێی ئەزمـوونی مامـۆستـایـانی خۆمـان چ جیهـانی بن، یان خۆمـاڵی، کە دەبێ ئەدیبی راستـەقینـە ئاوهـا بێو، هەمیشـە چەکـی ئەو قەڵــەمـێکی بێغــەل وغەش و بە ئەدەب بێ، قەڵەمێکی دوورروو نەبێ کە قەڵب بکاتە چاك وچاکیش بکاتە قەڵب: دەشبێ کەسـانی سادەی کۆمـەڵ لە نووسەرەکانمانەوە فێـر بن کە چۆن مامـەڵـە لەگـەڵ دۆست ودوژمن دا دەکـەن، چۆن رێـــزی گەورە دەگـــرن و چۆنیش زانـــاو نەزان لەیـــەك جودادەکـەنـەوە. هەر بۆ نمـوونـەشن لە بواری سەنعـەتکاریو پیشـەکانی ئابووریدا، تەماشا دەکەی وەستایەك چەنای چەن ساڵـە وەستـای پیشـەکـەیەتی، کەچی بەدەست شتێکی هەرە بچـووکـەوە گیـر دەخـواو، ناچـار پەنا دەباتە بەر شاگردەکەیو گیـروگرفتەکەی لێ حاڵی دەکا.. جالێرەش دا مەبەستمان ئەو نووسینـەیـە کە لەژمارە (١٥٧)ی گۆڤاری (بەیان)ی دلۆڤان دا بە ناونیشـانی (تـوانـج و پلار یا تەنگـوچـەڵـەمـەی چیـرۆك و چیـرۆکنـووس)وە بڵاوبـوەتەوە، کە تا ئێستا نە بە شاگردو نە بە وەستـایشـەوە ناوی نووسەرەکەیمان نەبیستووە. بێپاکانەو بێ ووردبـوونـەوە توانـج و پلاری گرتوەتە ئێمە جا زۆر لایەن هەن لیـــان بەگلەیم کە کە سانی ئاوهـا نە وەستـاو نە شاگـرد رێگـا دەدەن، بەنـارەواو قسـەهـەڵبـەستن ئامبازی ئەدیب و نووسەرە بێگـەردەکـانمـان ببن. بێئـەوەی ئەو ئەدیبانە ئەوانە بناسن و هێنـدەی نووکـە دەرزیەکیش زیانیان بۆیان هەبووبێ.. کاتی خۆی کە گۆڤـاری بەیان ژمارە (١٤٨) دەرچوو، مامۆستایەکی دەسـرۆ لە دەزگـای رۆشنبیـر و بڵاوکـردنـەوەی کوردی، داوای لێکردین کە ئەو ژمارەیە عەرز بکەین رای خۆمان سەبارەت بە چیـــرۆکـەکـان دەربـرین، جا بەوپێـیـەو لەبـەرئـەوەی بواری درێژدادری لە عەرزکردن دا نیە، بە بۆچوونی خۆمان هێندەی لێمان هەڵکرانبوو، کورتە رایەکانی خومانمان خستنە بەرچاو،

بەرستەی چڕوپڕوڕای بروسکە، وبێ پێچ وپەناوماستاو ساردکردنەوە، هێندێ لەو چیر[illegible]انەمان عەرز کردبوون. کەچی لەوەتەی ژمارە تایبەتیەکەی گۆڤاری (الاقلام) بۆ چیرۆك دەرچووە، چەند کەسێك عەرزی کردون وڕاو بۆچوونی جیاجیایان دەربڕیوە بە سلبی بێ یان ئیجابی، تەنانەت هەشبوون لەو نووسینانەیاندا دەمارگرژی یان پێوە دیاربوون، کەچی تائێستە کەسیش خۆی لێڵ نەکردوە. بەڵام چەند کەسێك بەرامبەر نووسینەکەی من تووشی هەڵچوون دەمارگرژی هاتوون وبێ ئەوەی بزانن لە هەموو ئان وزەمانێك دا کە ئەدەب هەروایەو هەرواش بووە، نەك تەشەر قسەهەڵبەستن وهێرش بردنە سەر، پاشان کەسانی دی هاتوون بەچاکی چوونەتە بنج وبنەوانەی ڕاستیەکانەوە، یاخود هەڵەکانی ئەو نووسەرەیان زانستیانە شی وچاك کروەتەوەو، نەك گاڵیان کردبێتە پەموو. بێ ئەوەی پەنایان بردبێتە بەزڕێگای جەوت و ڤیزە بەدەرخۆنە کردن وبەقسەی بازاڕی ونازانستیانە ئامبازی قەڵەمە ڕاست و بەئەمەکەکانیان بن. جا سەیر لەوەش دایە بنووسی (توانج وپلاریا..) هەر لە سەرەتاوە لەبەر پەلە پەل و دەمارگرژی و ڕق وکینە، لە پێشەکی یەکەیدا خۆی خستوەتە ناکۆکیەکی گەورەوەبا بزانین چ دەفەرموێ (ئەوەی ئەمەوێ ڕایگەیەنم تەنها ڕەت کردنەوەی (ئەو توێەڵە نووسینەی کاکی ڕەخنەتاشە)و بەس چونکی ئەوە ئیشی ئێمە نی یەو ئیشی ڕەخنەگرێکی بە ئینصافە) وجا ئەگەر ئیشی تۆ نیە ئەی بۆچی خۆت کردوتە ڕەخنەچیەکی بێ ئینصافەی زەمانەو بەقسەی هەڵەو پەڵە هێندەی دی چیرۆکەکانت ترشاندوە کوردیش زوو گوتویە (نان بۆ نانەواو گۆشت بۆ قەساب). لەوەتەی لە سەرەتای حەفتاکانەوە ڕۆژنامەو ئەدەبیاتی کورد هەلی چاکی بۆ ڕەخساوە، نەدیومانەو نە بیستوویشمانە (توێەڵە نووسین)، (ڕەخنەتاش)، کەچی دەیان ئەدیب ناتەبایی ئەدەبیان هەبووەو لە بۆچوون دا جیاواز بوون، بەڵام بە مەوزوعیانەوە وەرامی یەکدی یان داوەتەوەو نەچوونەتە قالبی قسەی حەشاماتی بازاڕی نا ڕەخنەوبێ پێزەوە. وادیاریشە ئەم (بنووسە) جیاوازی لە نێوان بازاڕی ئەدەب و بازاڕی وشەی لاوازدا ناکا؟!. داوای ڕەخنەگری بەئینصاف دەکاو کەچی خۆی کردوتە ڕەخنەچیەکی بێ ئینصاف و، وادەزانێ مانگەشەو چرای قوتیلکە نەوتینەو ڕێبوارێکی عاقڵە. لەو نووسینەی کە لە ژمارە (٧٤و ٧٥)ی پاشکۆی عێراق دا بڵاومان کردوونەتەوە، باسی ١٤ چیرۆك و ١٤ چیرۆکنووسمان کردوە، کە ئەوانە وەکو ناو دیارن و بەراستی ئەزموون دارن، کەچی ئەو برادەرە (بەئینصافە) تەنها بەرگری لە شەشیان کردوە. بەڵام چیرۆکنووسانی دیاری وەکو، حسێن عارف و، ڕەووف حەسەن و تایەر ساڵح سەعیدو عبدالله سەراج و اسماعیل ڕەسووڵ و ئەحلام مەنسووری پشت گوێ خستوون و، کاك (عبد الله ئاگرین) یشی داوەتە بەر لێشاوی هورژم و گومان لێ کردن. ئەوەشی ئاشکرایە کە تا ئێستا (ئاگرین) دەسپاکترین و دڵسۆزترین و بڕێزترین نووسەری کوردە، کە هێندەی نووکە دەرزیەکیش عەلامەی ئیستفهامی لەسەر نیە. ئەنجا ئا لێرەدا من لەجیاتی کاك (عبدالله ئاگرین) داوا لەو (ڕەخنەگرە) دەکەم ئەو چیرۆکەی وەکو سەر ڕاستیەك بۆ قسەکانی خۆی ئەگەر بەتاویش بهێنایەتەوە، تاکو کاری خۆماڵی لەلای جەنابمان وجەنابانی دیدا (سووك بووایە). کوردیش هەر زوو گووتوویە

(تاریکی مانگەشەو سەر لەئێوارەوە دیارە). نموونە یەکیش بۆ ڕاستی و ناڕاستیەکانی ئەو (ڕەخنەگرە) دەهێنینەوەو، مشتێکیش نموونەی خەروارێکە. ئەوەتا کە بەرگری لە چیرۆکی هاوار)ی کاك احمد محمد اسماعیل دەکاو دەڵێ (کاك غفور هەر بە زۆر سوار سەری ئەو چیرۆکەش بووە) وئەڵێ «نەیزانیوە یان نەیتوانیوە ڕەمزەکان تەوزیف بکاو دووبارەبونەوەی ڕەمزەکانی (ئەسپ)ە.» ئەگەر کەسێك مانای ئەمانەتی عیلم و ڕۆشنبیری نەزانی و لەلای نەبوو، دەسا چاوەنۆڕی ئەوەی لێ مەکە ڕاستگۆبێ، بۆ درۆو ڕاستیش ئەو نووسینەی خۆمان دەربارەی چیرۆکی (هاوار) وەکو خۆی دەیخەینە بەرچاو و بزانن چیمان نووسیوە (کاك احمد محمد اسماعیل یەکێکە لە چیرۆکنووسە ئەزموونداره‌کان و، پتر لە چارەکە سەدەیەکە لەم بوارەدا دەنووسێ، تا ئێستاش چوار کۆمەڵە چیرۆکی هەیە.. بەڵام چیرۆکی هاوار جۆرە نوێ کردنەوەیەکە وەکو تەکنیك و زمانیش لەلای ئەم چیرۆکنووسە لە چاو چیرۆکەکانی تریدا، ئەگەرچیش لێرەدا دیسان ڕەمزی چیرۆکی (ئەسپ)ە کەی دووبارە دەکاتەوە. بەڵام هەر نەئێستا لە زۆربەی زۆری چیرۆکەکانی ژمارە تایبەتیەکە پوختەترەو پتر پێوەر و پیوانەی چیرۆکی هونەری بەسەردا دەسەپێ).. ئیدی نازانم لە کوێ نووسیومانە (نەیزانیوە یان نەیتوانیوە). ئەگەریش باسی

دووبارەبوونەوەی رەمزی (ئەسپ)ەکەی کاك أحمدمان کردبێ ئەمەیان کەم کردنەوە نیە لە ئاستی چیرۆکەکە، ئەگەرچی بە نووسینەکەی ئەم (بنووسە)دا دەردەکەوێ کە چیرۆکی ئەسپ چیرۆکێکی سەرکەوتوو نەبووبێ. ئەگەریش بێتو چەند چیرۆکێکی سەرکەوتووی کاك ئەحمەد دەسنیشان بکەین، بێگومان چیرۆکی (ئەسپ) یەکێکە لەو چیرۆکە سەرکەوتووانەی، کە کاتی خۆیشی ئەو چیرۆکەمان کردوەتە عەرەبی و لەگۆڤاری (الثقافة)دا بڵاوبوتەوە. ئیدی نازانین، وادیاریشە قسە بەدەم هەڵبەستنەوە دیاردەیەکی هاوچەرخانەیە لەلای ئەم جۆرە (بنووسانە). دیاریشە کە هەستانی خۆی لە چەقۆی تیژ دەسوێ.. ئەگەر کەسێك بەچاوێکی ووردبینەوە ئەو نووسینەمان بخوێنێتەوە لە ژمارە (٧٤و ٧٥) پاشکۆی عێراق دا، بۆی روون دەبێتەوە کە ئێمە لەبەر خۆر سەرمان سپی نەکردوە هەروەکو کورد گوتوویە. تا (ناماقووڵی) ئاوها بکەین و بەهەموو بچووکیەکی گەورەیی خۆمانەوە، خۆمان لە هاوشانی یەشار کەمال بدەین، گەرچیش یەشار کەمال لەپرێ نەبووەتە کوڕێ، کەچی نووسەری لەو منداڵتریش هەبوون کە چەندان خەڵاتی جیهانی و نۆبڵیان وەرگرتووە. ئەو برادەرە نووسیون کە گوایە تەنها من ویە شار کەماڵ ئەفسانەو داستانما بەکار هێناوە. کەچی منیش ئێمەشی ئەوەمان نووسیوەو باسی ئەوەمان کردوە، کە یەشار کەمال داستانی (ئینجە مەمەد)ی کردوەتە شاکارێك، کە خۆشمان خولە پینرەمان هەبووەو گازندەی ئەوەمان کردە، بۆ نووسەرەکانمان بەقەرەیدا نەچوون.. کاتی خۆیشی کە باسی چیرۆکی (دیدەنی) کاك مستەفا ساڵح کەریم مان کردبوو، وبزانن چیمان نووسیوە (بابەتی ئەو چیرۆکەی کاك مستەفا ساڵح کەریم زۆرجار دووبارەکراوەتەوە، چ لە چیرۆکی جیهانی و چ لە چیرۆکی عەرەبیش دا، بەڵام مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو بابەتەدا لە نووسەرێکەوە بۆ نووسەرێکی دی دەگۆڕێ..) ناونیشانەکەیش هەر بەناوی (چیرۆکی دیدەنی و بەراوردکردنێك)ەوە بوو، نەخوازەڵا بەشێوەیەکی دی. هەروەها لە شوێنی دیی نووسینەکەدا نووسیومە: (ناشبێ وابزانرێ کە ئەم چیرۆکە دەقاو دەق لە چیرۆکی دییەوە وەرگیراوە).. ئیدی کەسانی دی هاتن و بەجۆرێکی دی لە قەڵەمیان دا ئەمەیان بۆخۆیان دەگەرێتەوەو، نووسیینەکەی ئێمەش تەنها دەسنیشان کردنی ئەو خاڵە هاوبەشانە بوو لە هەردو چیرۆکەکەدا، هەمووش

دەزانین لە قال و بەلا ئەدەبی بەراوردکاری هەبووە ئەو بنێین جارێکیان گووتی تووشی بڕادەرێکی ئەدیب بووم وتی: دەستت خۆشبێ و ئافەرین کە لە سەر فلانت نووسیوە، کەچی چووبووە لای فلانیش بەویشی گوتبوو دەستت خۆشبێ کەبەوجۆرە وەڵامی فلانت دایەوە (واتا من).. هەر دوای بیستنی ئەم قسەیە گەلی وەڕز بووم قەت خەیاڵی ئەوەم نەوەکرد کە برا ئەدیبەکانمان لە خەڵکی هەڕەمەی کۆمەڵ بەدتر بن. هەربۆیەش بریارمان دا ئەگەر سووژنمان پیانەکەن دەرزی بەکەس دا رۆنەکەین.. نووسەری (توانج وپلاریا..) لەسەرتاپای نووسینەکەیدا بەناکۆکی زمانی پژاوە، واش دەردەکەوێ کە هەر بەناکۆکیش قومات کرابێ. دوای ئەوەی کۆڵی هێرش و قسەی بێجێ و رێ و تەشەری ناشیرین ئاراستە کردوین و، نووسیویە (لەکۆتاییدا حەز ئەکەم مامۆستا غفور صالحی چیرۆکنووس دڵ گران نەبێت و ئەم چەند دێرەم بەدڵێکی پاك لێ وەرگرێت). جا ئەمەیان رێگای هەقی لە کوێیە؟ ئایا نووسینێکی بەزم سازی فەریك ناگەیەنی؟..

لەم سەردەمە جەنجاڵەش دا هەموو تەرازویەك لەنگ بووەو رەش و سپی لەیەك جیاناکرێنەوە قسەی ئەو برادەرەش ئەوەمان وەیاد دەخاتەوە، چۆن یەکێك چەقۆ بەسکی کەسێکی دیدا رۆکات و، دواجاریش پێی بڵێ (ببوورە نەمزانی) هیچی بە هیچ ناکا. دەربارەی سەرجەمی نووسینەکەی ئەو رەخنەگرە هەر ئەوەندەمان پێ دەکرێ ئەم سەربردەیەی بۆ بگێرینەوە جارێکیان زانایەکی ئاینی بۆ نوێژکردن. بۆ مزگەوت دەچێ و، لە مزگەوت کابرایەکی رووتەڵەی لێ پەیا دەبێ و پێی دەڵێ، مامۆستا پاڵتۆکەت بەنوێژ نیە، ئەویش بێ سێ و دوو پاڵتۆکەی دادەکەنێ و بۆ نوێژکردن خۆی دەکا بە ژووری مزگەوت دا. کابرایەکی دیش ئاگای لەم سەربردەیە دەبێ، هەرکە زاناکە لە نوێژ دێتە دەرەوەو یەخەی دەگرێ و، پێی دەڵێ زانایەکی مەزنی وەکو تۆ چۆن بەقسەی کابرایەکی نەزان دەکەی، ئەویش وەرامی دەداتەوەو دەڵێ هەتا ئەوم حاڵی دەکرد کە پاڵتۆکەم بەنوێژە خۆشم وەکو ئەوم لێ دەهات.. ئەم سەربردەیەشمان بۆیە هێنایەوە کە دەبێ ئەو نووسەرانەی باوەریان بەخۆیان هەیە ئاوها لەگەڵ کەسانی بێ بڕوا وەدەنگ بێن،

* *



# ئافرەت لە دەقی شانۆیی جیهانیدا

مەغدید حاجی

**وشەیەك :**

ئەگەر خوێنەر تەنیا بە هۆی خوێندنەوە تام و چێژ و سوود لە دەقی ئەدەبی وەکو شیعر، چیرۆك و ڕۆمان وەربگرێت، ئەوە دەقی شانۆیی دوو مەبەست دەپێکێ و مرۆی هونەردۆست، لە دوو لاوە تام و چێژ و سوودی لێ وەردەگرێت. بەمەش کاریگەریی و ڕۆڵی لە شیعر و چیرۆك ڕەت دەبێت و بە هۆی دەرهێنانی لەسەر شانۆگیانی وەبەردەخرێت و جەماوەر جگە لە خوێندنەوەی ئاسایی، بۆ تەماشاکردنی چیرۆکی شانۆیی نمایش کراو هەنگاو بەرەو هۆڵی شانۆ دەنێن و بۆ دووەم جار و بە شێوەیەکی تر دەقەکە دەخوێننەوە.

لەم ڕوانگەیەوە، نووسەری دەقی شانۆیی هەر لە کۆنەوە توانیویەتی پتر نووسین بکاتە چەکێکی هونەری کاریگەر بۆ چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتی یە هەڵایساوەکان و لە ناویانەوە کێشەی سەربەستی و مافە ڕەواکانی ئافرەتان.

لە ئەدەبی شانۆیی گریکەوە:

(ئەسخیلۆس (٥٢٥ ـ ٤٥٦ پ . ز) کە بە باوکی شانـۆی گریـك ناسـراوە، لە شانـۆیی (ئـافـرەتـە پاڕاوەکـان)دا باسی گەورەیی و ئازایەتی و توانای گەلی گریـك دەکـات و لە پەنـا ڕووداوە شانـۆیی یـەکەوە بۆ چەند جار ئاوڕی لە داستانی (ئایۆ) داوەتەوە.

لەتـەك ئەم کارە گرنگـەدا چەنـد تەنك و چەلەمەیەکی کۆمـەڵایـەتی و ڕەوشت و کاری ڕامیـاری خستـوونەتە ڕوو، لەگەڵ ئەمان دا دژ بە نەریتی بە زۆر بە شوودان وەستاوەو بە کارێکی چەپەڵ و دزێوی داناوە[١].

ئەم شانـۆگـەری یـە بە سروودێـك کۆتـایی دێت کە لە لایـەن کۆڕسـەوە دەگـوترێ و کۆڕسەکەش بریتی لە پەنجا کچە ڕاکردووەکە.

کۆڕسـەکە دەڵێ: «دەبا (زیوس) خاوەنی پاشایەتی، ئەو زیـۆسـەی کە بە دەستـە چاکـەرەوەکانی و بە هێزی بەزەیی ئازارەکـانی لەسـەر [ئـایۆ] دا کەم کردەمە لە شووکردنی بە خورتی، لە شووکـرد بە پیـاوێـك کە حەز لێ ناکـەم و لە تەکیـا ناگـونجێم دوورم بخـاتـەوە. باهێـز و سەرکەوتن بە کۆمڵی ئافرەتان ببەخشێ»[٢]

ئەگـەربێت و وەکـو شانـۆگـەریی یـەکی سەربـەخۆسەیری (ئـافـرەتـە پاڕاوەکان) بکەین؛ دەتوانین بڵێین ئەسخیلۆس لەم کارە ئەدەبی یـەیدا بە شێـوەیـەکی گشتی لە دژی بە زۆر بە شوودان وەستـاوە، چونکـە دیـاردەیـەکی ژیـانی کۆمەڵایەتی سەردەمی کۆمەڵگەی دواکەوتوو بووە!.

هەروا نووسـەر لە میـانـەی ئەم بەرهـەمـەیـەوە لە دژی مارەبـڕینی ئافـرەت لە خزمانی وەستاوە، چونکە زانیویەتی کە ئەم جۆرە بە شوودانـە تەنـهـا هۆوپێـداویستی ئابـووری و کۆمـەڵایـەتی چاوچنـۆك سەپـانـدوویـەتی و خزمـانی کچـە ویستـوویـانە بە هۆی ئەم جۆرە بە شوودانە بەشە میراتەکەی لە دەست بنەماڵەکەیان دەرنەچێت[٣].

بێ گـومـان ئەم جۆرە بە مێـرد دانـەیش دەبووە هۆی زەوت کردنی سەربـەستی ئافـرەت لە شوکـردن و هەڵبـژاردنی هاوسـەری ژیانی. بۆیە ئەسخیلۆس وەکو مرۆڤێکی چاکە خواز و هونـەرمـەنـدێکی بەدەسـەڵاتی خاوەن هەڵوێستی جوامێرانەلە دژی وەستاوە.

لە ڕێگـای ئەم نمـوونـەیـەی سەرەوەو بەرهـەمی تر لە شانـۆنـامـەکـانی ئەسخیلۆس دا، دەتـوانین ئەم کەڵـە نووسـەرە بەدیـارتـرین شانـۆنـامـە نووسی گریك لەقەلەم بدەین کەبە شێوەیەکی سەرنج ڕاکێش لەمەسەلەی ئافرەت دواوەو بەرگریی لە مافەکانی کردووە.

سەرەڕای ئەو تۆمـەتـە نارەواو کەم بەڵگـانـەی دراونەتە پاڵ (یـورپیـدس Euripdes) سێیەم کۆڵەکەی شانۆی گریك و ناو زڕاندنی بەوەی کەلە میانەی تراژیدی‌یەکانیدا هێرشی کردۆتە سەر ئافرەتان و ڕیسوای کردوون، زۆر لێکۆڵەرەوەی شارەزا سەلماندوویانە کە یورپیدس بەرگری لەدیموکراتیەت و مافی ئافـرەت کردووەو لە دژی دەوڵەمەندومشەخۆرەکان وەستاوە، بۆیە ئەمانیش پڕوپاگەندەی نارەوایان لە دژ بڵاوکردۆتەوە.

ئەم نووسە لە زۆربەی بەرهەمەکانیدا بە پیرۆزی و کاریگەی دەوری ئافـرەتی خستـۆتە ڕوو. بینەر یان خوێنەریش لەپاش خوێندنەوەیان بینینی هەر یەکێ لە شاکارە بەنرخەکانی وەکو؛ میدیا، ئەڤکینیا لە ئۆلیس و هیلین لەمیسر. سۆز و خۆشەو-یستی و ڕێزی بۆ ئافرەت پتر دەبێت[٤]

## ڕۆماو شانۆ و ئافرەت:

شانۆ بڵاوەکانی سەردەمی ئیمپراتۆریەتی ڕۆما نەیان توانی یان نەیان ویستووە لاسایی شانۆی گریك بکەنەوەو بابەتەکانیشیان لە ئاستێکی ئەدەبی نزمدابوون. دەقی شانۆیی ڕەسەن لەسەر شانۆکانی ڕۆما نمایش نەکراوە، بەڵکو تەختەی ئەم شانۆیانە بۆ مەبەستی ڕابواردن وگاڵتەجاری خرابوونە گەڕ!

پیشـان دراوە شانـۆیی یـەکـانیـان بریتی بوون لە (فارس)و گاڵتـەجـاری ڕووت و بێ شـەرمانە کە لە یەك پەردەدا لە لایەن چەنـد ئەکتـەرێکی ئافـرەت و پیـاوەوە پێشکەش دەکران و هەر هونـەرمـەندێك چۆتە ناو قالبی کاراکتەرێك و ناوێکی تایبەتی و دەمـامکێکی بۆ خۆی هەڵبـژاردووەو بە جووڵانـەوەو لەبـەر گیرانەوەی چەند نوکتەیەك دەورەکەی بینیوە.

شایانی باسە کە بینەری ئەو کاتە پتر چێژی لە لاسایی کردنەوەی بێ دەنگ وەرگرتووە، سەماکەری دەمامەك داریش لەم جۆرە نمایشانەدا جۆرەها هەڵوێست و سۆزی دەربریوە.

. . لە سەدەکانی ناوەراست دا:

ئەگەرچی ئاینی فەلەکان لە سەرەتای بڵاوبوونەوەیدا بە تایبەتی لە چەرخی چوارەم بەرەوژوور کە بە شێوەیەکی رەسمی بەسەر بت پەرستیدا زاڵ بووە، قین و بێزاری بەرووی پیشاندراوە شانۆییەکانی ئەو کاتە دەربریوەو لەعنەتی لە شانۆکردووەو ئەکتەرەکانی گرتوون و شانۆکانی داخستوون، بەڵام لە سەدەی دەیەم بە سەرەوە هەر لە رێگای دێرو پیاوە ئاینییەکان و نەریتەکانی دێرەوە شانۆو دراما سەریان هەڵداوەتەوەو دوو بارە بایەخیان پێ دراوەو تەنانەت بۆ خزمەتی ئاینی فەلەو نەریتە ئاینییەکان خراونەتە گەڕو قەشەو راهبە ئافرەتەکانیش بە ئەرکی نواند هەڵساون.

بابەتی سەر بە ئاینی مەسیح و باسی ئادەم وحەواو جەنگە و شەڕو شۆری خاچ پەرستەکان لە لایەك و لەولاشەوە شانۆی گاڵتەجاڕیو رابواردن کاری و بۆ پێکەنین بابەتی سەرەکی شانۆگەرییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست بوون لە شانۆگەرییە ئاینییەکان دا ئافرەتی بەرێزو خانەدان دەوری بینیوە، بەڵام لە بەرهەمەکانی بەشی دووەم دا گاڵتە بە دەورو کەسایەتی ئافرەت کراوە.

لەو سەردەمەدا هەست بە بوونی شانۆگەری کۆمەڵایەتی سەرکەوتوو ناکرێت کە بەرگری لە دەورو کەسایەتی ئافرەت کردبێت[٥]

**نموونە لە سەردەمی شکسپیر بە سەرەوە:**

لە کۆتاییەکانی سەدەی شازدەهەم وسەرەتای سەدەی حەڤدەهەم دا (شکسپیری مەزن ١٥٦٤ - ١٦١٦ ز) پایەیەکی دیارو گەورەی لە بواری شانۆنامە نووسیندا پەیدا کردووەو شانۆگەرییەکانی هەموو لایەکی مێژوویی کۆمەڵایەتی و دڵدارییان گرتۆتەوە. بە تایبەتی بابەتی خۆشەویستی و وەفاداریو ئافرەت لە هەردوو شانۆیی (ماکبێس)و (رۆمیۆو جولێت) دا بە تێروانینێکی پێشکەوتووو بەرز خراونەتە روو.

دوا بە دوای شکسپیر، نووسەری ناوداری فەرەنگ (مۆلێر ١٦٢٢ - ١٦٧٣) باسی ئافرەتی کردووەو پاڵەوانە شانۆییەکانی لە بۆتەی مێینەی زیندووو خاوەن هەڵوێستی سەربەخۆدا سەریان هەڵداوەو گەشانەوەیان بە خۆیانەوە بینیوە.

(هنریك ئیبسن ١٨٢٨ - ١٩٠٦)ی نەرویجی یەکێکە لەو شانۆنامە نووسانەی کاریان کردۆتە سەر بزووتنەوەی شانۆگەری جیهان و خاوەن بەرهەمی زیندوو کاریگەرن.

یەکێك لە شاکارەکانی ئیبسن شانۆنامەی (ماڵی بووکە شووشە)یە کە لە ساڵی ١٨٧٠دا دایناوەو بۆتە بەڵگەنامەیەکی ئەدەبی دەربارەی خستنە رووی ژیانی زۆربەی ئافرەتانی کۆمەڵگەی بۆرژواو مەسەلەی ماف و سەربەستی ئافرەت.

(مەسەلەی ماف و سەربەستی ئافرەت مەسەلەیەکی راوەستاوە بەهێزە کە ئیبسن لە شانۆیی (ماڵی بووکە شووشە)دا لێی دەدوێ و لە زۆربەی نووسینەکانیدا پشتی ئافرەتی گرتووەو ویستوویەتی وەك پیاو سەربەستی خۆی وەربگرێت.

ئیبسن لە یەکێك لە ئاهەنگەکانی رێزلێنانی ئافرەتان دا وەڵامی ئەو کەسانەی داوەتەوە کە دژی کۆتایی شانۆیی (ماڵی بووکە شووشە) کەی وەستابوون و وتی: «سوپاس ئەم رێزلێنانەتان دەکەم، بەڵام من دژی ئەو قسانەم کە پێچەوانەمن لە بەرگریی کردنم لە مەسەلەی ئافرەت من وام لێ هاتووە مەسەلەومافی ئافرەت تێنەگەم، بەڵام ئەم مەسەلەیە بە نیسبەت منەوە مەسەلەیەکی مرۆڤایەتییە»[٦].

(ئەوەی گرنگە لێرەدا بوترێت ئەمەیە، کە ئەگەرچی مێژووی شانۆ هەر لە سەرەتاوە ناوی چەند ئافرەتێکی وەکو ئەمانەی خوارەوەی تۆمار کردووە: (جۆکاستای

شاژن) له شانۆگەرییەکەی سۆفۆکلیس (شائۆدیب)دا ، یان (میدیای شازادە) لە شانۆگەرییەکەی یورپیدیس (میدیا)، یان (لێدی ماکبیس) له شانۆگەرییەکەی شکسپیر (ماکبیس)دا یان کەسایەتی (کلیوباترا) له شانۆگەرییەکەی (ئەنتۆنیۆو کلیوپاتر)ی شکسپیردا . . . هتد، ئەمانە هەمووی چەند نموونەیەکن لەو ئافرەتانەی کە شانۆنامەنووسە بە توانـاکانی شانۆی گریك و کلاسیکی باسیان کردوون.

ئەگەر تەنیا سەیری ناوەکانیان بکەین دەزانین کە ئەمانە هەمووی شا ژن و شازادەن یان بە شێوەیەکی روونتر هەمووی لە چینی حوکمرانی سەردەمی خۆیان بوون و نموونەیەکی زۆر کەمیش بوون.

لە کاتێك دا ئافرەتی رەش وروت و چەوساوەی کۆمەڵ کە زۆربەی کۆمەڵی ئافرەتان بوون بە جارێك لە لایەن ئەو نووسەرانەوە لەبیر کرابوون. بەڵام ئیبسن پەتی ئەم جۆرە پاڵەوانانەی قرتاندو هەر لە ناوجەرگەی کۆمەڵەوە لە حاڵەتێکی تراژیدیدا ئەو ئافرەتانەی کرد بە پاڵەوانی شانۆگەرییەکانی خۆی کە دووچاری هەزارەها دەردەسەری ژیانی کۆمەڵایەتی ئەبن.

ئەگەر دیزدەموونە نموونەیەکی ئەو ئافرەتانە بێت کە شکسبیر لە (عوتەیل) دا باسی دەکات، جێگری ئەم شاژنە لای ئیبسن لە شانۆگەری (ماڵی بووکە شووشە) دا دەدۆزینەوە، ئەویش (نورا) یە کە ژنی فەرمانبەرێکی بچووکەو هەر لە سەرەتاوەش لە خێزانێکی ئاساییدا پەروەردە بووە[١].

هەندێ درامانووسی جیهانی وەکو ئیبسن و برناردشۆو تشیخۆف بە شداری کاریگەریان لە گۆرانکاری کۆمەڵایەتیدا کردووەو لە دوایشدا لە گۆرانکاری رامیاریدا . .

بۆ نموونە ئیبسن دەورێکی گەورەی لە والاکردنی دەرگای گفتوگۆ دەربارەی باری ئافرەت لە کۆمەل دا بینیی و لە ئاکام دا ئافرەتان مافی هەڵبژاردن و دەنگ دانیان لە هەڵبژاردن دا دەست گیر بوو. ئەم مافەش تاکو ئێستا لە ژێر چاودێری سەرکردایەتی بزووتنەوەی ئازادکردنی ئافرەتان دا پارێزراوە[١٠].

**نموونە لە دەقی عەرەبیدا :**

ئەحمەد شەوقی لە شانۆنامەکانی داو بە تایبەتی لە (مجنون لیلی) و(کۆژرانی کلیوباترا) و (قمبیز)و (شاژنی ئەندەلوس) و (عنترە) دا بایەخی بە کەسایەتی و دەوری ئافرەت داوە. تەنها وەکو ئافرەتێکی جوان باسی (کیلوباترا)ی نەکردووە بەڵکو ئافرەتێکی زیرەك و رۆشنبیرەو چالاکانەش لە پێناوی بە هێزبوونی وڵاتەکەی لە ناوەخۆو دەرەوەیدا خەباتی کردووە[٩] . .

لە بیستەکانی ئەم سەدەیە بە سەرەوەو بە تایبەتیش لە پەنجاکان بەرەوژوور، هەندێ دەقی شانۆیی عیراقیش، پێکشەوتنخوازانە چارەسەری کێشە کۆمەڵایەتییەکانیان کردووەو بایەخیان بە مەسەلەی ئازادی ئافرەت و مافە رەواکانی داوەو تا رادەیەك دەوری ئافرەتیان لە چوارچێوەی مل ملانێی ئابووریو کۆمەڵایەتیدا وەکو مرۆڤێکی دوو جار چەوساوەو رەنجدەری ماندوو ماف خوراو رێگا پێ نەدراو لە هەڵبژاردنی هاوسەری ژیانیدا، یان وەکو دایك و خوشکی قارەمان لە گۆرەپانەکانی خەبات دا، یان وەکو دەزگیران و دڵداری پەیمان پەروەر یان وەکو نموونەی ناپەسند؛ ئافرەتی ترسنۆك و راڕا، بەد رەوشت و داوێن پیس خستوونەتە روو و بۆ هەر حاڵەتێکیش چارەسەر دەست نیشان کراوە. لێرەدا هەر

نووسـەرێـك لە گۆشـە نیگـاو بیروڕای تایبەتی و ڕادەی تێگـەیشتن و لێکـدانـەوەو دەسەڵاتی خۆیەوە خۆی لە قەرەی ئەم بابـەتـە داوەو زۆربـەیشیـان لەسەر گرنگی دەوری ئافـرەت لە کۆمـەڵ دا یەکیـان گرتووەو داوایان کردووە کە دەبێ ئافــرەت شان بە شانی پیــاو شوێنی خۆی لە کۆمەڵ دا بگرێت و بچێتە مەیدانی کارکردنی بەرهەم دارو لە بواری ڕۆشنبیریشدا بوونی خۆی بسەلمێنێت.

ئەو بیرو ڕایەشیان پووچەڵ کردۆتەوە کە دەڵێ هۆی دواکـەوتـوویی ئافـرەت بۆ باری تایبـەتی فسیولۆجی و سایکــۆلــۆجی دەگـەڕێتـەوە کە کۆنـەپـەرست و کەم هۆشیارو نەزانەکان کردبوویانە بیانگە بۆ بە ڕەوا زانینی چەوسـانـدنەوەی ئافرەت و بە یەك چاو سەیر نەکردنی لەگەڵ پیاودا.

بۆ سەلمـانـدنی ئەم بۆچـوونەی سەرەوەش خوێنەر دەتــوانێ چاو بە (زحیـدە)ی موسـا شابـەنـدەور (من دایکتم ئەی شاکــر، کلیــل، کاولگـە، ماڵی نوێ، خان و خیط البریسم)ی یوسف العانی و بەرهەمەکانی (سعــدون العبیـدی) و (نـور الـدین فارس) و (قـاسم محمـد) و (محی الـدین زەنگەنە)دا بخشێنێت و بۆی دەردەکـەوێت کە ئەم نووسەرە بەڕێزانە لە ژمارەیەك لە شانـۆنـامـەکـانیـان داو لە چوارچێوەی قالبی هونەری بەرزدا داکـۆکیـان لە ماف و ئازادی ئافـرەت کردووەو نمـوونـەی ئافـرەتیـان وەکـو مرۆڤی کاریگـەرو زیندوو خاوەن هەڵوێست خستۆتە ڕوو[10].

**پەراوێزو سەرچاوە:**

(١) ئەحمـەدسالار، دەروازەی دراما، بەشی دووەم، ل ٦١.

(٢) مســرحیـات عالمیـه، المستجیـرات لأشیـل، المستجیرات وابناء هیرقل لیوریپید، ترجمة د. علي حافظ، ل ٩٠.

(٣) الدكتور جمیل نصیف التكریتي، قراءة وتأملات في المسرح الاغریقي، ل ١٢٣.

(٤) علي النــور، ملامــح مصــریــة في المسـرح الاغریقي، هیلین في مصر، دانانی یورپید وەرگێرانی علی النور.

(٥) عبــد الـرحمن صدقي، المسـرح في العصـور الوسطی الدیني والهزلي.

(٦) بارزان عثمــان، ئەپسن و شانـۆی شۆڕشگێـر، گۆڤـاری ڕۆژی کوردستـان، ژمـارە تایبـەتی یـەکـەی شانۆ، ١٩٨٠.

(٧) فاضــل علي جاف، ئافـرەت لە درامـای نوێی ئیبسن دا، هاوکاری ژمارە ٢٥٦، ٢٨ - ٢ - ١٩٧٥.

(٨) مارتن اسلن، تشــریـح الـدرامـا، وەگێـرانی بۆ عەرەبی یوسف عبد المسیح ثروة، ل ١٠٨.

(٩) لانـدو، تاریـخ المسرح العربي، وەرگێرانی د. یوسف نور عوض.

(١٠) شایــانی باسـە کە ئێمـە لە ژمـارەیـەکی سالی ١٩٨٧ی (بـەیـان)دا لێکـۆڵینـەوەیەکی ترمان بە ناوی (ئافرەت لە دەقی شانۆیی کوردی‌دا) بڵاوکردۆتەوە.

لێکۆڵینەوە

# ئەم شاعیرە بناسە
# مەلا نەجمەدین بێ بەش .

نووسینی هەردەوێل کاکەیی

هەق پەرست وراست بێــژ ، زیـرەك ووریـا ، چاوتێـرو میـوان دۆسـت ، رووخۆش وگاڵتــەچی ، پیـــرێکی دڵ تەڕ، خاوەن هەڵبەست و هۆنراوەی پڕ ئاوازی کوردی ڕەسەن .

شاعیــر ناوی نەجمــەدین کوڕی شێــخ عەلی کوڕی شێـــخ ئیسماعیل کوڕی شێخ حەمزەیە لەبنەماڵەی ساداتی بەرزنجی یە .

لەسـاڵی ١٩١٥ی ز لەدێی (فـەقێ میـرزا)لە هەرێمی ناحیەی (شوان)کە سەربەشاری کەرکوکە لە بنەماڵەیەکی ئاین پەروەر هاتـووەتـە جیهان لەساڵی ١٩٢١ی ز لە سەرداب و نەریتی ئەو ڕۆژگـارە لای باوکی چووەتە حوجرەو فێری نووسین و خوێندن بووه، قورئانیشسی هەر لەلای باوکی خەتم کردووه .

بووه، قورئانیشسی هەر لەلای باوکی خەتم کردووه .

مەلا نەجمـەدین لە تەمـەنی دەساڵیدا باوکی فەرمانی یەزدانی بەجـێ هێنــاوە، جار (شێــخ ئەمین ئیسمــاعیــل )ی مامی دانشتـووی (شارباژێر)دەیباتە لای خۆی وئەرکی پەروەردەو بەخێـــو کردنی دەگـرێتـە ئەستـۆ. لای ئەم مەلایـانـەی خوارەوە زانیاری بەدەست هێناوە :-

١ـ مەلا قادر لەگوندی چنگنیان .

٢ـ مەلا محەمەدی تلیانی لە گوندی تلیان لە ناحیەی ئاغجەلەر.

٣ـ مەلا مستەفا ـ لەمزگەوتی قەڵای شاری هەولێر

٤ـ مەلا سەیید ئیسماعیل مایلەیی لە گوندی کاریزەی خاڵخالان .

٥ـ مەلا مەعسووم مەلا خدری هەورامی لەشاری کۆیە .

٦ـ مەلا عەزیز شیلەخان لەشاری کەرکوك .

شاعیــرمــان لە ساڵی (١٩٣٢ز)یــەوە دەستی بە خوێنـدەوەو نووسیـنـی شیعــر کردووەو نازنــاوی (بێ بەش)ی بۆخــۆی هەڵبـژاردووە، بەدەیـان کتێب و دیوانە شاعیرە کلاسیکی یە بە ناو بانگـەکانی کوردی خوێندوەتەوە وەك دیوان و بەرهەمی ئەم کەڵە شاعیرانە : مەولەوی، نالی ناری، مەحوی، شێخ ڕەزا ، قانیـع ، پیـرەمێرد ، گۆران ، بێ کەس . بێخود، تاهیر بەگ جاف، حاجی قادری کۆیی، بابـا تاهیـری عوریـان ، سالم وەفـایی ،وەلی دێـوانـە، خانـای قوبادی ، صەیدی هەورامی ئەحمەد موختار بەگ جاف ، . . هتد

هەروەهـا کتێبی گوڵستـانی سەعدی و دیوانی حافظ شیرازی و عومەر خیام و بەدەیان کتێبی عەرەبیشی خوێندوەتەوە .

بەرهـەمـەکـانی بێ بـەش هەمـە جۆرن ،لـە هەمـوو بابەتێك هۆنــراوەی دانــاوە وەك : رامیــاری، نەتــەوایــەتی ، ئاینی و سۆفیگـەرێتی ، ئەوینی و دڵـداری، ئامـۆژگـاری ، هەجـوو، داستـانـە شیعر هۆنراوەکانی لە ڕووی ڕوخسارو ناوەڕۆکەوە بێ گرێ و ڕەوان و پاراوو نایابن ، پڕن لە وردەکاری و خۆشەویستی و وەفـایی و سۆز دەربڕین کەرەستەی نوێی ئەم ڕۆژگارەی بەکار هێنـاوەو هۆنـراوەکـانی پێ رازانـدوەتـەوە وەك : ئامێری ڕادار، ڕادوێ ، کارەبــا ، گڵۆپ ، دارتێـل . . هتـد ئەمـەش چەنـد خشتێکە لە نموونەی هونەرەکەی :

**وەکو (رادوێ)دەناڵێنم سویچی دەنگەکەی لایە**
**ئەگەر باسە ، ئەگەر خواسە ، ئەگەر شیعرە، ئەگەرنایە**

شاعیـر لێـرەدا خۆی دەکـاتە ئامێری(رادوێ)ودەست پەنجەی ئازیـزەکـەشی دەگـرێ و دەیخـاتـە سەر سویچـەکـەی ئەویش خۆی وخوای چۆن ئارەزووی لێ بێ بەوجۆرە یاری پێ دەکات و سویچەکەی دەگۆڕێت .

یان :

**وەکو (دارتیلی کەهرەبای ، بەدوو فینجان و دوو گلۆپ**
**ئەترسم بمکوژی، شۆرتی ، خودا ڕەحمێ بکەی خوایە**
**لەم خشتە(بەیت)ەدا بالآی خۆشەویستە**
**نەشمیلانەکەی بەدارتیلی کارەبا دەبینێ و چاوە**
جوانـەکـانیشی بە دوو عەلەتریك و مەمکە خرەکانیشی بە دوو فینجان و ناوێرێتیش لێی نزیك ببێتەوەو دەستی بۆبەری نەوەکو شۆرتی تێدا بیۆ وبیێ بەهۆی نەمانی .
یان دەڵێت:

**وەکو (رادار)ە دڵی من کە دڵبەر لێێ بزر نابێ**
**لە کوێ بێت و کوێ بڕوا کە وێنەی ئەو لە دڵمایە**
شاعیـر لەم خشتـەدا دڵ و دەروونی خۆی دانـاوە بە ئامێـری (رادار) ، جـا دڵـدارەکـەی لە هەرکـوێ بێت لێی بە ئاگـایـەو هەمیشە وێنەکەی تیا دەبینێت و لەپێش چاویدا بزر نابێ .
مەلا نەجمـەدین لەم گوندانە دانشتووە: گوندی (مام ڕەش)لە ناحیـەی شوان ، (عـەلی مووسـا) ، (دالآوا ڕووتە)لە هەرێمی (ئـاغجـەلـەر) ، ئێستـا لە گونـدی (تەکیە)ی دەربەندبازیان لە هەرێمی چەمچەماڵ دادەنیشێ ، ئەگەر خوا یار بێ دیوانەکەی بەدوو قۆڵـی لەگـەڵ کاك فەهـمـی مەجیـد کاکـە یی‌دا لەدەرفـەتێکـدا چاپی دەکـەین و بلاوی دەکـەینـەوە لەپێناوی بزوتنـەوەو دەولـەمـەنـدکـ ـنی کەلە پوور ئەدەبی نەتەوەکەمان ئەمەش پێنج پارچە هۆنراوە لە بەرهەمەکانی شاعیر:

- ١-

(پێنج خشتەکی ـ غەزەل)

قوربانی جەماڵت بم کە ـ ـماڵت عەینی چرایە
ئەو چاوە کەوەت چاوی کەوو وەك چاوی سەقەر [١] وایە
بەو حەسرەتەوە دمرم ئەو داخە لە دڵمایە
وەکو ڕادوێ دەناڵێنم سوێچی دەنگەکەی لایە
ئەگەر باسە ئەگەر خوا ـ گەر شیعرە ئەگەر نایە

**

دەبا برژێتە خواری فرمـ ـکی چاوت بە دڵۆپ
لەداخی ئەو دەستە گوڵ ـ خودا بوتی کردووە بە تۆپ
پێ لەسەر بەنزین دابنێ گوێ مەدە هۆپ و ئستۆپ
وەکو دارتێلی کە هرەبای بەدوو فینجان و دوو گلۆپ
ئەترسم بمکوژی ، شۆرتی خودا ڕەحمێ بکەی خوایە

**

کە شەوقی ڕوومەتی ئاڵی لە کۆسپەی دڵ ئاوا نابێ
خودا ڕەحمێ بەحالم کەی کە ئەم ژینە کەوا وابێ
ئەگەر قورکەم بەسەر خۆما بەڵێ ئەم کارە چا نابێ
وەکو ڕادارە دڵی من کە دڵبەر لێی بزر نابێ
لە کوێ بێت و لە کوێ بڕوا کە وێنەی ئەو لە دڵمایە

**

فەلەك خۆشی لە من ناوێ دژ ی من دێت و دەورانی
لە مەرجێکاکە من کردم تە سوچی ئەو بوو دۆرانی
دەبا هەش [٢]کەم بەسەر خۆما چلۆن سووتانی خەرمانی
دڵم وەك مەوجی ڕادوێیە بە دەست خۆیەتی گۆڕانی
دەمی کوردم دەمێ عارەب دەمێ چیرۆکو زورنایە

**

- ٢-

(غەزەل)

**چاوەکەم چاوەڕوانی تۆم کەی دەبێ بڕوانی بۆم**
**زولفەکەت لادە لەسەر گۆنات ئەو پەڕی ئاواتە بۆم**
**وەکو مەجنوون کە شێواوم لەناوەند گێژو لافاوم**
**وەکو فەرهادە [٦] ئەنجامم دەست لە ڕۆحی خۆم ئەشۆم**
**جارێ ناپرسی لەحالم پێم بلێ دەردت چییە؟**
**پەرش و پەراگەندەو پەرێشان و ڕەنجەڕۆم**
**مانگ و خۆر خەجالەت بارت گەر پەرچەمی هەڵداتەوە**
**وەك چەمی گۆچان چەمیون دسوڕێن پشت کوڕ و کۆم**
**وا لەشەوقی تۆ دەسوتێم دێ لە جەرگم بۆن سۆ**
**هەستی ڕووناکی ئەکەم وە پەروانە بۆ شەمع و مۆم**
**گەر دەمێ دوری دەمی جاری سبی بێ ڕوو بەڕووم**
**شیفایە بۆ زامی جەرگم سیل و دیق و سێبەرۆم**
**(بێبەش)ی بێ چارە لەم کاتەدا سوچی چییە**
**هیچ هیوایەکی نەماوە کە ئەو بلێ من پێیا بڕۆم**
**(اللە صل علی محمد وعلی آلە أجمعین یارب)خودایە**
**لێمان خۆش بی میهرەبانیمان لەگەڵ نەکەی بە فەضلی خۆت**

**

**(پێنج خشتەکی بێبەش لەسەر غەزەلی ناری)** [١٩]
**بە باوو بۆنی باخی تۆیە ژیانم من هەمووکات**
سەرو سامان و مولکو ماڵ و جان و [٢٠] ڕۆحم بێفیدات
ئەی لەگەل جێماو خۆم قوربەسەر چیم بەسەرهات

پاکەتی شیرین مەفادی حەزرەتی شاهانە هات
هەروەکو تووتی بە کوڵیٚ قەندەوە مەردانەهات

**

وەرە خوٚتکە خاکی پیٚ ، لەم هەلەدا جا فرسەتە
ئاخو ئوخی ئوی خوٚت دەرکە لەدڵ ئەم حەسرەتە
هەلی وا رێك ناکەویٚ جاریٚکی کە خوٚ زەحمەتە
بوٚ موبارەك بایی ئەم عەیشو سروورٚو عوشرەتە
تایەفەی ئاغاو بەگلەر ، عەشرەت و بیٚگانە هات

**

وەکو قەقنەس[21] دەسووتیٚم کە جیٚماوم لە یاران و رەفیق
وەکو مەل کەوتوومە داوی (أين المفرأين الطريق)
نەخوشو دەردەدارم جەرگی خواردم سیل و دیق
جەمعی دەرویٚش و مەلاو سوٚفی لەگەڵ ئەهلی تەریق
ساقی و مەینوٚش و مەست و مورشیدی مەیخانە هات
بمکوژن خویٚنم بریٚژن بمکەنە جەژنی بەرات
موستەحەقی کوشتنم بوٚ ئەم ریٚگەی هات ونەهات
توٚکە هاوکاری لەگەڵ پینەچیو دوٚمو خەرات
دەف زەن و شمشاڵ زەن و پاکی دەنگە خوٚشی وڵات
شیٚت و صەرعی گیٚژو غافڵ ، عاقل و فەرزانە هات

**

پەراویٚزەکان

(١)سـەقـەر: داڵ ، جوٚرە هەڵـوٚیـەکـە . (٢)هـەش خم(٣) مەجنـوون: قەیسی عامـریـیـە، دڵدارەکەی لەیلای خەڵکی نەجـدە، لە راستیـدا شیٚت نەبووە بەڵام پلەی دڵداری بوٚلەیلا وای لیٚ کردووە کە مەجنوونی لەیلای پیٚ بوتریٚ، باوکی لەیلا نەیـدایێ ، قـەیسیش دای بە هەردەو بیـابـانـداو دەستی شیعـر گووتن، لەداخـا لەسـاڵی (٦٨٨ز)مـرد (٤)گـوٚش :گـویٚ .

(٥)بنیامین : کوری یەعقووب پیٚغەمبەرە (د.خ)

(٦)فـەرهــاد: بەرد تاشیٚـــك بووە لە سەردەمی خوســرەوی پەرویٚزدا، عاشق بە شیرینی ئەرمەن بووە

(٧)مـەحـوی (١٨٣٢ـ ١٩٠٦ز)شـاعیری بەناوبانگی کورد بە‌مەلا محـەمە کوری مەلا عوثمان باڵخییە، دیوانەکەی لەلایەن ماموٚستـایان مەلا عبدالکریمی مدرس و محمدی مەلا کەریم بوٚجاری دووەم لە ساڵی ١٩٨٤ی‌ز لە چایخـانـەی ئوٚفسیٚتی (حسام)لەبەغدا لە چاپ دراوە

(٨)دیا: ، بەمەعنا شویٚن و وڵات .

(٩) دەیر : شویٚنی رەبە مەسیحی‌یەکان(١٠)ئەشك فرمیٚسك

(١١)لام: تەریـك (١٢)خـاشـاك : پووش و پەڵاش

(١٣)ریٚش : برین (١٤)پـەژمـوردە: سیس بوو. (١٥)دەر: دەرگـا، پیٚش دەرگـا. (١٦)بـەرق: بروسـکـەی هەور(١٧)خـەرابـات : مەیـخـانـە (١٨) بەدمـەستی : سەرخـوٚشی لەرادە بەدەر (١٩)ناری: (١٨٧٤ـ١٩٤٤ز)ناوی مەلا کاکە حەمەی بیٚلوە ، دیوانەکەی لە

لە ساڵی ١٩٨٤ی‌ز لەلایـەن کاکـەی فەلـلاحـەوە بە یارمـەتی ئەمینـداریٚتی گشتی روٚشنبیـری‌و لاوان لە چاپخـانەی کاکەی فەللاح لە سلیٚمانی لە چاپ دراوە .

(٢٠)جـان :گیان (٢١)قەقنەس: پەلەوەریٚکە ئەوەندە دەفریٚ و بەرزدەبیٚتـەوە تا تینی خوٚر دەیسـووتیٚنیٚ و دادەکـەویٚ. (٢٢) قەند: شەکروکلوٚ (٢٣)خەروار: ( خەربار: بارەکەرٚسەنگیٚکە نزیکەی سەد کیلوٚ دەبیٚ (٢٤)دووبەرە: دووبەرەی هەنگوین .

(٢٥)ئـاشیان هیٚلانە . (٢٦)خرووس: کەڵەشیٚر. (٢٧)جوٚن بەجـوٚن: جوٚربـە جوٚر (٢٨)دوودەر: دوو دەرکی ، دەرکی ، دەرگای دوو چاوی (٢٩)قەل: داڵە رەش. (٣٠)عەینەلمەل: باڵـداریٚکی رەشەلە چوٚلەکەیەکی قەڵەو گەورەترەو زوٚر دوژمنی کوللەیەو پوٚل پوٚلیش بەکوٚمەڵی دەفرن زیانیشی بوٚمیٚوە زوٚرە .

# بۆچوونی چوارەم

● زاهیر ڕۆژبەیانی ●

لێكۆڵینەوەیەكە لەبارەی (كێشی) لاوك و حەیران و بەیتی كوردی‌یەوە.

لاوك و، حەیــران و، بەیــت ئەوەشیــان با لەوێ بوەستێت كە لەڕووی نێـوەڕۆكـەوە بەهایەكی مەزنی مێژوویی‌و، ئەتنوگرافی‌و، ئەنتـەرپـۆلـۆجی زۆریـان هەیەو پێویـست بە توێژینەوەی زانستیانە دەكـەن. لەڕووی هونـەریشـەوە بیـان گریت هەمدیس هەتا بڵێی بەپێـزو پیت و فەڕن و، ئەگـەر بە وردی لێیان وردبینەوە دەبینین لە سەرێكـەوە پەیـوەنـدییان بە هونەری گۆرانی‌و مۆسیقاوە هەیەو، لە سەرێكی دیكـەشـەوە پەیـوەنـدیـان بە ئەدەبــەوە هەیــە، لە ئەدەبــەكــەش دا (گــەلێـك پەیـوەنـدی بەتینیـان بە چیـرۆك و، پەخشـان و، شانـۆو، شیعـریشـەوە هەیەو، ئەگەر لێیان بكۆڵینەوە گەلێــك ڕەگــەزی هونــەریی وەك. وێنـەی شیعـریی‌و، ڕووداو وبـەسـەرهـات و، كێشـەی كۆمـەلایـەتی‌و، كەسایەتی جیاجیاو، گفتـوگـۆ (حـوار)و دەنگی جیـاوازو، شێـوەكانی گێڕانەوەیان تێدا بەرچاو دەكەون.

كەچی تائێستـا بایـەخی پێـویـست بەم لایەنەیان ـ لایەنی هونەریی ـ نەدراوەو، ئەوانـەشی بەڕووكـەشی‌و لە لابـاس دا خۆیـان لێ‌داوە ئەوەنـد لەیـەكـەوە دوورن و ئەوەند جیاواز بۆی چوون كە دەتوانم بڵێم: دەگەنە ڕادەی ناكۆكی‌و دژایەتی.

[. حەیران (...)ئەو پەخشان ڕازاوەی سەروبن گرێدراو...]ە.[1]

«ئەسعەد عەدۆ»

[مامۆستا ـ گۆران ـ سوودی لەچەند كێشێك وەرگرت كەوێنەیان لە لاوك و حەیراندا هەبوو.][2]

«ئازاد عبدالواحد»

[ . یەکێتی شنەو ئیقاعی شیعرییان (لاوك و حەیران و بەیت)بەر چاوە، ئەگەرچی، برگەی دەنگەکانی دێرە شیعرەکانی، بەتەرازووی کێشی (عەرووز)ی یاکێشی (پەنجە)یی بەستەو گۆرانیو شیعری تازەمان کێشانە ناکرێن . . ][2]

«عەلی فەتاح دزەیی»

[ . هەست دەکرێ کێشی لاووك و حەیران، کە نەکێشی عەرووزە ونەکێشی پەنجەیە، خۆی گەیاندۆتە کاروان و . . . ][4]

«کەریم مستەفا شارەزا»

دەتوانین ئەم سێ بۆچوونەش ئاوا شیبکەینەوە.

ئەسعەد عەدۆ، کە دەڵێ: حەیران (پەخشان)ە، واتا دەڵێ: نەشیعرەو، نە (کێشی)هەیە.

کاك (ئازاد عبدالواحد)یش کە دەڵی: مامۆستا (گۆران) بۆ نوێ کردنەوەیشیعری کوردی سوودی لە (کێش)ی لاوك و حەیران دیوە، بە واتایەکی دیکە دەڵێ: حەیران و لاوك پەخشان نین وشیعرن، شیعرێکی (کێشدار)یشن و (کێش)ە کەشیان (کێشی پەنجەیی)ە، چونکە (گۆران) لە شیعرە نوێیەکانیدا کێشی پەنجەیی بەکار بردوە.

هەرچی مامۆستا (عەلی فەتاح دزەیی) شە‌دژی بۆچوونەکەی (ئەسعەد عەدۆ) دەڵێ: لاوك و حەیران و بەیت پەخشان نین و شیعرن و (کێش)یشیان هەیە، وەلێ تاسەریش پشتگیری رایەکەی (ئازاد) ناکات و ئەگەرچی وەك ئەویش دەڵێ: لاوك و حەیران شیعرن و، (بەیت) یشیان دەخاتە پاڵ، بەلاّم بۆ (کێش)ە کەیان دژی دەوەستێت و دەڵێ: نە بە کێشی عەرووزیو نە بە (کێشی پەنجەیی) ناکێشرین. بۆچوونەکەی مامۆستا (کەریم مستەفا شارەزا)ش، ئەگەرچی هەر دووبارە کردنەوەی دەسپێشکەرییەکەی (عەلی فەتاح دزەیی)ە، بەلاّم زۆر بەدڵنیاییەوە باسی (بوون)و (بلاّوەکردنی) ئەو کێشە نهێنیو بێناوە نە (عەرووز)یو نە (پەنجەیی)ە دەکات.

خوێنەر لە ئاستی بیرو بۆچوونی ئەم مامۆستایانەدا کە رێکەوت وایە هەر چواریشیان خەڵکی مەڵبەندی لاوك و حەیران وبەتین ـ تووشی دڵەراوکێ و سەرەگێژکێ دێت، ئەگەر خۆی بۆ خۆی چنگەکرێیەك نەکات.

ئێمە ئەوەش دەزانین کەکێش هەر (کێشی عەرووز)یو، (کێشی پەنجەیی) نییەو بیرێتەوە، لە شیعری گەلانی دیکەی وەك (ئنگلیس)و (لاتینی)و (یابانی)و . . . دا، کێشی دیکەش بەکار دەبرین کە نەوەك (عەرووز)یەکە حیسابی کورت و درێژی برگەی تێدا دەکرێت و، نەوەك (پەنجەیی)یەکەش رێژە یا یەکسانی ژمارەی برگەی تێدا رەچاو دەکرێت، وەلێ بۆمان هەیە رووی دەم لە مامۆستایان (عەلی فەتاح دزەیی)و (کەریم مستەفا شارەزا) بکەین و بپرسین: سروشتی ئەو کێشە نهێنیو بێناوە چییەو چۆنە کە ئەم دێرو رەستە شیعرییە کورت ودرێژانەیان پێ دەکێشرێت؟!.

[١ـ ترسا من، باڤێژە گۆلا خوینیانە.
٢ـ گۆلا خوینیان کوورە، تێداتێ فشینا ماران و چەلپینا ماسیانە.
٣ـ بابێ غەربی ژ هێلا ژێر ڤەتێ، ل ئاڤا چەم دخینە، پێلاڤە دگەرینە ل سەر پیلانە][5]

یا ئەم دوو دێرە:
[١ـ ئەگەر حەزێ دەکەی، زوو خاتوون تەورێزیی ببینی.
٢ـ ئەوە لەخری بالینێ، دکێشێ ماینێ شی خز لە بەرایتی خێلی، لەدووی دەرۆنەوە دوو جوانۆڵەی قولە بژە، یەکساڵ و دوو ساڵن، وەختێ بۆ خاترێ ناسرو ماڵ ماڵ بینەوە بەر[6] عەققەی دەزینی
[١ـ دەرێم براینە برادەرینە ئەورۆ ئێوارێ چەندی گاز دەکەم حەیران کیژۆرە سیانێ . ]
٢ـ ئەتۆ چاوێ خۆت گەلە گەلە رەشمەکە بە کلی . . سبیانێ مارێ بابی تووم لێی دەنساوە بەسەر دەکەتن لە (شەوەك)و (مەلا ئەومەر)ی، دمپەرینە لە (بەستۆرە)و، یە ستۆرەی گۆرانێ هەریان دەداوە لە بن گردی (بانەمان)ی . ][7]

هەرچی چۆنێك بێت، ئەگەرچی من بەش بەحاڵی خۆم لەشوێن کەوتنی ئەم سێ بۆچوونەدا نەگەیشتمە نهێنی کێشی نە عەرووزیو نەپەنجەیی، وەلێ مایە پووچیش لێی دەرنەچووم و هەندێ بیرورام لەلا گەلاّلە بوون کە لەم خالاّنەی خوارەوەدا وەکو (بۆچوونی چوارەم ) دەیان خەمە پێش چاو.

یەکەم: مۆسیقای شیعری دێرین وباوی داهێنراو، کوردیو ناکوردی بەشێوەیەکی گشتی، لەتێکرژانی رەزمی ناوەو ئاوازی دیوی دەرەوە پێك دێت، ئاوازە دەرکییەکەش لە ئاوێتە بوونی

کێش و سەرواوە پەیدا دەبێت. بە واتایەکی دیکەش دەتوانین بڵێین: مۆسیقای شیعری باو لە تێکرژانی ئەم ڕەگەزانەوە پێك دێت.

ڕەزمی ناوەوە + کێش + سەروا.

بەڵام بۆ مۆسیقای شیعری هاوچەرخی کوردی وجیهانیش دەتوانین بڵێین:

**شاعیری هاوچەرخ بۆ بەدەست هێنانی سەربەستی‌یەکی پتری دەربڕین دێت پشت بە دوو ڕەگەزی یەکەم و دووەم دەبەستێت و، ڕەگەزی سێ‌یەم کە (سەروا)کە یە دەکاتە قوربانیی واتاو، لەڕێکخستنی (سەروا)دا زۆر لە خۆی ناکات و دوای ناکەوێت، مەگەر خۆی بە ڕێکەوت بێتە پێشەوە. بە شێوەیەکی دیکە بۆمان هەیە بڵێین: مۆسیقای شیعری هاوچەرخ لە ئاوێتە بوونی:**

**ڕەزمی ناوەوە +کێش.**

**پێك دێت و، (سەروا )ڕۆڵێکی لاوەکی تێدا دەبینێت. وەڵی لەشیعری لاوك و، حەیران و بەیت دا حاڵەتەکە سەبارەت بە ڕۆڵی (کێش)و (سەروا)پێچەوانە دەبێتەوەواتا حەیران بێژو، لاوك بێژو، بەیت بێژ، بە پێچەوانەی شاعیری هاوچەرخەوە، لە پێناوی بەدەس هێنانی سەربەستی‌یەکی پتری دەربڕین دا، دێن ڕەگەزی (کێش)ەکە دەکەنە قوربانی‌و بۆ پاراستنی مۆسیقای شیعریش پشت بەڕەگەزی یەکەم وسێ‌یەمی ڕەگەزەکانی شیعری دێرین و باو دەبەستن و شاعیری هاوچەرخ چەند بایەخ وگرنگی بە (سەروا)ەدەن، ئەمانیش هەرئەوەندە بەتەنگ (کێش)ەوە دێن، واتا ئەمانیش بۆ تەرازووکردنەوەی کێش زۆر لەخۆ ناکەن، مەگەر خۆی بەڕێکەوت بێتە پێشەوە. بەکورتیش دەتوانین بڵێین مۆسیقای شیعریی لاوك وحەیران و بەیت لەم ڕەگەزانەوە پێك دێت.**

**ڕەزمی ناوەوە +سەروا.**

**کەواتای ئەمجا لێرەدا (کێش )ڕۆڵی لاوەکی دەدرێتی.**

**ئنجا ئەگەر(ئاوازی ناوەوە)+(کێش)تێکستی ئەدەبی بکەن بەشیعر، ئەبی بۆ (ئاوازی ناوەوە)+(سەروا) ئەو ئەرکەیان پێ ڕەوا نەبینرێت؟! لە کاتێك دا بۆ ڕاگرتنی ئاوازە دەرکی یەکەی شیعر (سەروا)لە (کێش)بەکارترەو ئەوانەی دەقی شیعری فۆلکلۆری لەزاری خەڵکی‌یەوە کۆدەکەنەوە پتر هەست بەم ڕاستی‌یە دەکەن و دەزانن کە خەڵکی لەگێڕانەوەی شیعردا وشە دەگۆڕن وپاش پێشیان پێ دەکەن و هەندێ جار هەربەتەواوی لەبیریشی دەکەن - ئەمانەش هەموو کارلە کێش دەکەن - وەڵی زۆر بە دەگمەن وشەی کۆتایی لەبیردەکەن یا دەسکاری دەکەن و دەیگۆڕن، چونکە (سەروا)کەی پێوەیە. ئێمە ئەمانەمان تەنها وەکو ڕاستی‌یەك خستە پێش چاو، دەنا لێك جیا کردنەوەی (شیعر)و(پەخشان)بە بوون و نەبوونی (کێش)و(سەروا)وە بەند نی‌یەو بە دەیان پارچە شیعری بێ (کێش)و(سەروا)مان هەیە کە هەر بەتەنها بە هۆی جوانیی (ڕەزمی ناوەوە)گەیشتونەتە پلەی شیعری نەمرو، بەدەیان بگرە بەسەدان (هۆنراوە - نظم)ی بەکێش وسەروامان هەیە کە ناتوانین بەدڵنیای‌یەوە بیان خەینە خانەی شیعرەوە.**

**(ت. س. ئەلیوت)لە چاوپێکەوتنێك دا وتویەتی: شیعری (درامای شیعریی)دەبێ(سەروا)دار بێت. بەڵام بۆ (کێش)ئاواپێی دانەگرتووە. . (٨)**

**(حاتم محمد صگر)یش، لە لێکۆڵینەوەیەك دا لەمەڕ درامای شیعریی عەرەبی‌یەوە وتویەتی:**

**(. . ئەگەر بمانەوێت شیعری نوێمان لە شانۆدا کاریگەرتربێ (. . )دەبێ لە گرفتەکانی (کێش)ی ڕزگار بکەین.)[٩]**

(کێش)کۆسپێکی گەورەیە لەڕێی سەرکەوتنی شیعری درامی ئامێزدا، بۆنمونە، جاری واهەیە (گفتوگۆ- حوار)ەکە تەواو دەبێت، بەڵام (کێش)ەکە پڕ نابێتەوە، بەپێچەوانەشەوەجاری وا

دەبێت(گفتوگۆ)کە تەوا و نابێت ، بەڵام (کێش)ەکە پڕدەبێتەوە حاڵەتی یەکەم شاعیر ناچار دەکات بۆپڕکردنەوەی (کێش )وشەی زیادە بەکار بەرێت، حاڵەتی دووەمیش ناچاری دەکا لەسەر حیسابی واتا وشە بقرتێنێت.

وەك دەزانین شیعری لاوك و حەیران و بەیتیش شیعری درامی ئامێزن و لەوە دەچێت لاوك بێژو حەیران بێژو بەیت بێژانی کورد- زۆر زووتر هەستیان بەم کۆسپە کردبێت سەروا(یان گرتووەو کێش)یان هێشتوتەوە بۆ ڕێکەوت.

لەبەر ڕۆشنایی ئەم دیاردەیەش دا ، دەتوانین بڵێین : شێوازی شیعری لاوك و حەیران وبەیت زۆرلە شێوازی شیعرە کێشدارەباوەکانی ئێستامان لەبارترە بۆ شیعری درامی و، درامای شیعریی و، سترانە شانۆو، ئۆپەرێت و ، ئۆپێراو، چامەی درێژو، بالادە شیعریش.

لەهەمووشی چاکتر ئەوەیە کەبوونی ئەم شێوازە ڕەسەنە لە ئەدەبی دێرینمان دا ئەو بیانووە نابەجێیە دەبڕێ کەگوایە شیعری بێ کێش نامۆیە بە ئەدەبەکەمان و، گوایە گوێی مرۆڤی کوردی پێ ئاشنا نییەو ،چێژی لێ نابینێ.

دووەم: شیعری باو، شیعری نووسراو- ئەوەی بۆ خوێندنەوە دەگوترێ - هەستی بینین دەدوێنێو ،پانیو درێژیو ، ڕووبەری کاغەز کارلە ڕادەی کورت و درێژی دەیرەکانی دەکەن و، نووسینیش لە شێوەیەکی دیاریکراوی نەگۆڕدا مۆمیایان دەکات،

وەلێ شیعری لاوك و حەیران و بەیت شیعری سەرزارەکییەو، هەسی بیستن دەدوێنێو ، بۆ (چرین)ە، واتا بۆ (خوێندن)، نەك بۆ (خوێندنەوە)ئەمەش بواری زیندوویی و ئەفراندنی دووبارەو گەشەکردنی بەردەوامی بۆمسوگەر دەکا. هەر ئەمەش یارمەتی بەیت بێژو حەیران بێژو لاوك بێژان دەدات کە بەهۆی خێرا (خوێندن)ی دێرە درێژەکان و، خاوکردنی دێرە کورتەکان، یا لێکدانیان، یادووبارە کردنەوەیانەوە، واتا بەهۆی گۆڕینی ڕەزمی چڕین و لەرێ بەکار بردنی هەندێ وشەیوەك (ئایو، ئاخ ئۆف و ئەمان و. . )و، هەندێ وشەی دەنگداری بێواتای وەك (لێ لێ)و، ( لۆ لۆ) وە بەسەر (نەبوونی)ی (کێش)دا زاڵ بن و، ئەو بۆشاییە پڕبکەنەوە کەئەو (نەبوونی)یە دروستی دەکات.

سێیەم : لە شیعری حەیران و لاوك و بەیت دا تەنانەت پەیڕەوی داب و نەریتی بەکارهێنانی (سەروا)ی شیعری ئاساییش ناکرێو ، لەم بوارەش - تارادەیەك - سەربەستی هەیە:

لە شیعری ئاساییدا(دێر)یەکەی بناغەییە ، بۆیە(سەروا)ش لەکۆتایی دێردا دادەترێ، بەڵام لەشیعری لاوك و حەیران و بەیت دا ، (ڕستەی شیعری)بەیەکەی بناغەیی دادنرێ، بۆیە لەدانانی (سەروا)داحیساب بۆ کۆتایی(واتا)، یاکۆتایی(وێنەیشیعری)دەکرێ، نەك کۆتایی(دێر)، مەگەر ڕێکەوت وای بێنێ واتا، یاوێنە شیعرییەکە - ڕستە شیعرییەکە ودێرەکە پێکەوە کۆتاییان بێت.

سەروا ، لەلاوك وحەیران وبەیت دا - بەزۆری -(جووت سەروا)یەو، حەیران ولاوك بەیت بێژان خۆیان بە (سەروای ئەستوونی)یەوە نابەستن، مەگەر بەبێ زۆر لەخۆکردن بۆیان هەڵکەوێ زۆر جاریش نیشانەی کۆ (ان)و(ن)، یایەك وشە هەر بە هەمان واتاوە - لەبەر ڕاگرتنی سەروا - لەدوو دێری یەك لەدوا یەك دا بەکار دەبەن، هەندێ جاریش - سەروا - کە تەنها لەیەك پیت، یاهەر لە پیتە بزوێنێك پێك دێت ، بەتایبەتیش پیتە بزوێنی (ێ)بەزۆری لەم جێیانەدا بەکار دەبرێ، بەبێ

ئەوەی گوێ بەلێکچوون ولێك نەچوونی پێتەکەی پێشی بدرێت.

ئەم دیاردەو ئەم جۆرە مامەڵە کردنانەش هەموویان لەشیعری ئاسایی‌دا بەخەوش دادەنرێن ، بەڵام لەلاوك و حەیران و بەیت دا کارێکی ئاساییین وجگە لەمانە (سەروا)ناوەوەشیان تێدا بەکار دەبرێت. چوارەم : لەبەر رۆشنایی ئەم بیرو بۆچوونانەدا،

دژ بە بۆچوونەکەی مامۆستا (ئەسعەد عەدۆ)کە دەڵێ : حەیران پەخشانە ، لەگەڵ مامۆستایان(ئازاد عبدالواحدو، عەلی‌فەتاح دزەیی‌و کەریم مستەفا شارەزا)دا دەڵێم : حەیران و، (لاوك وبەیت)یش شیعرن و پەخشان نین، بەڵام بەپێچەوانەی ئەمانیشەوە دەڵێم : لاوك وحەیران و بەیت ئەگەرچی شیعریشن وەلێ‌شیعری بێ‌کێشن . ئەگەر لەبەیتێك دا، یالە حەیرانێك دا، یالە لاوکێك دا ، چەند دێرێکی هاوکێشیش بەرێکەوت هەڵبکەون ئەوساش هەربە (کێشی پەنجەیی)دەکێشرێن، نەك بەکێشی نەعەرووزی ونەپەنجەیی.

لەکۆتایی‌دا دەڵێم : حەیران ولاوك وبەیت ئەنجامی کەڵەکە بوون وتێکرژان و خەست بوونەوەی چالاکی هونەریی‌وئەزموونی داهێنەرانەی سەدان ساڵەی نەوەکانی پێش خۆمانن و، لەشێوەو شێوازیش دا گەلێك لەشیعری نوێی جیهانی‌یەوە نزیکن و ، گەلێك رەگەزی هونەریی بەرچاویان تێدایە کەبو نوێ کردنەوەی شیعری هاوچەرخی کوردی، لەئەدەبی بیانیان دەخوازین، یابە بیانووی پاراستنی رەسەنایەتی ئەدەبەکەمانەوە بەربەرەکانیان دەکەین و هەوڵی سەرکوت کردنیان دەدەین . بۆیە خۆزگە دەخوازین شارەزایان وپسپوران خۆیان لەگەڵ شی کردنەوەیان ماندوو بکەن کێ دەڵێ : بۆچوونی پێنجەم و، شەشەم و هینی دیکەش پەیدا نەدەبوون؟!

سەرچاوەکان :


١- ئەسعەد عەدۆلیرەیەخك . لەگەنجینەی نەتەوەی کورد بەنما ١٩٨٤ ل/(١١)

٢- ئازدا عبدالواحد دیوانی شێخ نووری شێخ سالح بەرگی‌یەکەم بەشی‌یەکەم بەغا- ١٩٨٥/ل (٢٥١)

٣- گۆڤاری نووسەری کورد/ژمارە(٣)ی‌خوولی سێ‌یەم داستانی مەمی ئالان، ناساندن و لێکۆڵینەوە/عەلی فتاح دزەیی/ل٥١

٤- گۆڤاری کاروان ژمارە(٧٤)ی نیسانی١٩٨٩ دیوانی کاروانی ساڵی شەمم خوێندەوە بەشی دووەم وکۆتایی کەریم مستەفا شارەزا ل - (٩٠)

٥- چیرۆك نفیس مەمێ ئالان بەغا١٩٧٧ل - (٦٤)

٦- ئۆسکارمان تحفەی مظفریە بەشی دووەم بەغا ١٩٧٥ ل - (٣٣)

٧- هەمان سەرچاوەی ژمارە(١)/ل (٨)

٨- ف. أ. ماثیسن ت. س. الیوت، الشاعر الناقد/ت: احسان عباس بیروت ١٩٦٥ص (٢٩٩)

٩- مجلة الكلمة العددالرابع السنة السادسة - تموز-١٩٧٤ محمد الماغوط دراما الحلم والحرية حاتم محمد صگر ص-٨٤




## شاعیری نیشتمان پەروەری ناوچەی خانەقی ١٨٩٤- ١٩٤٩

نووسینی: هیدایەت ئەحمەد

شاعیری باسەکەمان شێخ بابا عەلی (بێدار)ە، کە زانایەکی دینی و شاعیرێکی نیشتمان پەروەری نوێخواز بووە تا ئێستا لێ کۆڵینەوەیەکی ئەوتۆی لەسەر نەکراوە هەقی خۆی بدرێتی نووسەر ئیبراهیم باجەلان یەك دوو وتاری لەسەر بلاوکردۆتەوە بەلام بەکورتی دەربارەی دواوە، بەگوێرەی ئەوەی کاك ئیبراهیم پێی وتم نیازی ئەوەی هەیە ئەو شیعرانەی کەلایەتی لە نامیلکەیەك دا چاپیان بکات ، هەولی زۆرم لەگەل بنەمالەکەیان دا بۆوەدەس هێنانی شیعرەکانی جێی داخە کورەکانی سۆراخی تاقە دێرێکی شیعری باوکیان نازانن ، تەنانەت دەیانگوت وێنەیمان نی یەو (دفترنفوس)ەکەشی ، کە وێنەی پێوە بوو تەسلیم دائیرەی نووسمان کردوە.

### ژیان و بەسەرهاتی (بێدار):

ناوی: (شێخ بابا عەلی کوری شێخ عەبدوللای کوری شێخ عەلی کوری شێخ لەتیفی کوری شێخ سەلیمی هەنجیرانە)[1]، لە لەبنچینەدا ئەگەرێتەوە سەر نەوەی (پیریونس)[2]، کە لە کتێبی نور الانوار دا باس کراون: شێخ عەبدوللای باوکی لای خانەقی لە (ئاوایی گەورە)[3] نیشتەجی ئەبێت و لەوێیش هاوسەر بۆخۆی پەیدا ئەکات و خێزان پێکەوە ئەنێت. لە سالی (١٨٩٤)[4]ی ز کورێکی ئەبێ ناوی ئەنێ (بابا عەلی)بەمندالی فێری خوێندنی ئەکات تا تەمەنی ئەگاتە دوانزە سالان ، پاشان ئەینێرێتە شاری خانەقی لە خزمەت شێخ سالح مودرس دا دەست ئەکاتە خوێندن لەتەك ئەمەش دا بەهۆی خوێندنەوەی شیعری شاعیرەکانەوە سەودای شیعر نووسین پەیدا ئەکات، لەپێش دا تەخمیس لەسەر غەزەلی (حافظ)ئەکات و باوکیشی بەپێنوسی شیعرەکانی باباعەلی ئەنووسێتەوە، کاتێ باوکی کۆچی دوایی ئەکات دەست لە خوێندن هەل ئەگرێ و ئەگەرێتەوە بۆدێکەی خۆیان (شێخ محمد امین)[5]ی برای (بێدار)ئەلێت:-

«بێدار دوای دەس هەل گرتنی لە خوێندن گەراوە تەوە (دێ)[6] کەی خۆیان بۆژیاندنی خێزانەکەیان بۆچەن جارێکم مالەکەیان بار ئەکات و ماوەیە هەروا بە سەر لێ شێواوی و بێ کار و پیشە ئەبێ، پاشان دەست ئەکاتە کاسبی و زەوی کێلی و کشت و کال کردن. هەروەها مەلا یەتیشی ئەکرد بەلام نەك بۆ تەماعی دونیا بەلکو لەرێگای خودا (بێدار)بەو پارەی داهاتە جوتیایی یە ئەژیا، دێوەخانێکی باشی هەبوو، لەژیانی دا چوار

ژنی هێنــاوە لە ژنێکیــان کورێکی ئەبێ و ئەمرێ، لە ژنێکی تریان کە ئامۆزای خۆی بووە سێ کوری هەیە ئێستا لە شاری کەلار ئەژین (بێدار) پیاوێکی بالا بەرزی جوان خاسی رەنگ ئەسمەری دەم و چاوپر بووە زەلامێکی زۆر تەرپۆش بووە، هەر پارچەیەك گران بای بوبایە ئەو قاتی کەواو سەڵتەی لێ ئەکرد، رووخـۆش و سەخی تەبیعـەت بوو، هەر هەژارێك رووی تێ بکـردایـە بۆیارمەتی ئەیبردە پەنایەکەوەو هەرچی لە کیسەکەیدا ببــوایــە ئەیـدایـەو پێی ئەوت با هەر خۆت و خوا بزانن کەمن یارمەتیم داوی. بابا عەلی لە ژیانی دا گەلێ حەزی لە سواری ئەسپ کردووەو ئارەزووی بە خێــو کردنیشی ئەکــرد بۆ ئیشی تایبەتی و کشتوکاڵ ودیدەنی مەلاو هاورێکانی لەوانە: مامۆستا سەیـدا حەکیم، مەلا حەمە سەعیدی کولەجۆ، مەلا عەباس ،مـەلا محەمەدی عەدلەخان ،مەلا ئەحمەدی هۆرینی، مەلا ئەحمەدی دەکە»

ئەمـەی دوایی یـان بۆ مردنی (بێـدار) پـارچـە شیعرێکی نایابی نووسیـوە بەنـاو نیشـانی (تاریخی وفاتی مرحوم شێخ بابا علی «اغفرله)تیایدا باسی چۆنیەتی مردن و شوێن و کات و هۆکەی دەگێرێتەوە.

خوالێخـۆش بوو (عـلاء الـدین سجـادی)لە مێژ ووی ئەدەبی کوردی شێخ بابا عەلی بێداری هێناوە، ئەویش ساڵی (١٨٩٢ - ١٩٤٩ز)[١]ی بۆ مێژ ووی لەدایك بوون و کۆچ کردنی داناوە.

بۆمێـژ ووی کۆچ کردنی لەگـەڵ کاك ئیبـراهیم باجـەلان یەك ئەگرنەوە، بەلام بۆ مێژ ووی لەدایك بوونی جیاوازن وەکو پێی بزانم کاك ئیبـراهیم چۆتـە بنج و بنـاوانی بابـەتەکەو خۆیشی خەڵکی ناوچـەکـەیەو پەیوەندیشی بە بنەماڵەی(بێدار)ەوە هەیە بۆیە راستی یەکەی بۆ ساغ بۆتەوە.

**شێخ بابا عەلی و نازناو:**

شێـخ بابـا عەلی لەسـەرەتـادا (بـابا)ی کردوەتە نازناو لە شیعر نووسین دا پاشان (بێدار)ی بەکارهێناوە، ئەم نازناوەش ئەدیبی پایـە بەرزی کورد خوالێخـۆش بوو (رەفیق حیلمی)بۆی داناوە (شێــخ محەمــد امین) ی برای ئەڵێ «شێــخ بابـا عەلی برام هاورێ یەکی دڵسـۆزی خوالێخـۆش بوو رەفیق حیلمی بوو لە کاروباری سیـاسی دا بابـاعـەلی ئەنـدامێکی چالاکی (حزب هیــوا)بـوو. جارەهـا رەفیق حیلمی لە کەرکـوکـەوە ئەهـاتـە خانـەقی بۆ چاوپێکـەوتنی شێـخ بابـا عەلی و هاورێکـانی، وە لەگەڵیان دا کۆ ئەبووەوە لە بارەی گیروگرفتەکانی (حزب)و بلاو کردنەوەی مەنشوراتی حزب بە دێهاتەکانی ئەو ناوچەیەدا. هەر وەهـا (بێـدار)یش چەن جارێـك لەخـانـەقینـەوە چۆتە شاری کەرکوك بۆ دیتنی (رەفیق حیلمی)و لە گەڵی دا کۆبۆتەوە. هەر ئەویش ناوی (بێـدار)ی لێ نـا، باش ئەزانم ناوی نهێنی شێخ بابـا عەلی لە (حـزب هیـوا)دا (بێـدار)بـوو. . هەرلەو دەمەدا بەردەوام گۆڤاری (گەلاوێژ)و بلاوکراوەی سیاسی تر ئەگەیشتنە دەستی، ئەویش بە ناوچـەکـەدا بلاوی ئەکـردەوە بەسـەر هاورێکانی دا»

**بێدار و شیعر:-**

لە ماوەی ژیـانـی دا شیعـری زۆری دانــاوە، کارەســات و رووداوەکـانی ئەو سەردەمە لەناو شیعرەکانی دا رەنگی داوەتەوە. بەتـایبەتی شیعرە نیشتمانی یەکانی کە تێیدا هانی گەلەکەی داوە بۆ رزگـار بوون لەو باروودۆخـە ئالـۆزەی کەتیـایدا ژیاوە لە دژی ئیمپـریـالیـزم و نۆکـەرانی و بۆیەکگـرتن لەپێنـاوی تەفرو تونـاکـردنی خوێن مژانی گەل و داگیـرکەرانی ولات دا. جێی داخـە لەهـەمـوو شیعرانەی ژمارەیەکی زۆر کەمی لێ ماوەتەوە لەوانـە چەن پارچـە هەڵبـەستێکی کەلـە ژمـارەکـانی گۆڤاری (گـەلاوێـژ)دابـلاو کردۆتـەوە. . بۆلـە ناوچـوونی دیـوانـە دەسنـوسـەکـەی(بێدار)، نووسەر محەمەد عەلی قەرەداخی لە پێشـەکی دیوانی (جەفایی)دا نووسیویە «دۆستی خۆشەویستم کاك (ئیبراهیم باجەلان )بۆ گێرامەوە وتی: ئەمەنم یەك ساڵان بوو کە باوکم کۆچی دوایی کرد، باوکم خوێنـەوار بوو، لەگەڵ خوێنـدەواری یەکـەیشیـدا دەستی خوشنـوسی و وینـەکێشانی هەبوو، پاش لە دونیا دەرچوونی پر سندووقێکی گەورە کتێب و دەسخـەتی لێ بەجێ مابـوو، ماوەیـەك سنـدوقـەکـە لە ماڵەوە کەوتبـوو، دوایی کەس وکـار وتیـان: ئێمە چاومان بەرایی نادا ئەم سنـدوقـە لەم ماڵـەدا بێت و، ئێمە هەرچەند چاومان پێ ی بکـەوێت وەك کۆسمان کەوتبێت وایە! هەڵسان سندووقەکەیان دابـە کۆڵیـان داو بردیـان دایـان بە دەم ئاوی سیـروان)ەوەکاك ئیبــراهیم ئەڵێ کاتێ گەورە بووم و فامم کردەوە پرسیم وتیــان ئەوسنـدوقە گەڵێ دەسخەتی نایابی تێدابووە، دیوانی شیعری باوکم - خۆی تێــدا بووە، دیـوانی بابـا عەلی بێـدار(وچـەنـد شاعیری دیکە کوردی تێدا بووە»[٨]

بێدار جگەلە لە زمانی کوردی فارسی و عەرەبی وتورکیشی زانیوەو شیعریشی پێ دانـاون، بەسەرهاتی خۆی لە هۆنراوەیەکی درێژدا بە زمانی فارسی داناوە جێی داخە ئەویش لەناووچوە. ئەگەر لەو شیعرانەی (بێدار)بکۆڵینەوە ، ئەتوانین بیانکەین بەدوو بەشەوە: بەشی یەکەمیان سەرتای دەست پێ کردنی شاعیریتی (بێدار)پێشان ئەدات و کاریگەری شیعرەکانی نالی و سالم و مەولەوی و کوردی وحاجی قادری پێوە دیارەو نەشی توانیوە لەوشە بێگانە خۆی رزگا رکات ئەو شیعرانەش کەلەو قۆناخەدا وتوونی ئەگەڕێنەوە بۆ دەوروبەری جەنگی یەکەمی جیهانی بەشی دووەمیشیان کە ئەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای جەنگی دووەمی جیهانی گۆرانێکی تەواویان بەسەردا هاتووە چ لە بارەی بەکار هێنانی وشە سادەی کوردی یەوە چ لەبارەی ناوڕۆکەوە.

بێداری شاعیر لەم قوناخەدا وەکو ئەحمەد موختارو فایق بێکەس و قانیع و ئەسیری و شاهۆ هەنگاوێکی نیشتمان پەروەرانەو شۆرش گێرانەی ناوە، بەشدار بوونی (بێدار)لە (حزب هیوا)دا زیاتر هەستی نیشتمانی بزواندووە بۆیە لەو قۆناخەدا بایەخێکی زۆری داوەتە هەڵبەستی نیشتمانی

**بێدارو شیعری نیشتمانی:**

بێدار لە شیعری نیشتمانی دا دەستێکی بالای هەبووەوەکو شاعیرە شورش گێرو نیشتمان پەروەرەکانی تری سەردەم و پێشی خۆی هاتۆتە ئەو مەیدانەو ئەمەندە ئاوو خاکی نیشتمانی خۆی لا پیرۆزو خۆشەویست بووە ئەگەر سەودای سەیرانی بیوایە . . ئەوا دیدەنی یەکی شاری سولەیمانی لەلای ئەو لەپاریس و لوبنان خوشتر بووە وەك لەم تاکە شیعرەدا دیارە:

**نیدای تەبعم دەمێ ویستی بکەم یادی هەوا گۆڕی**
**وتم پاریس وەیا لوبنان ؟ وتی (بێدار)سولەیمانی**

(بێدار)بیرو باوەڕێکی تەواوی هەبووە بەمەسەلەی نەتەوایەتی ، ئەوەشی ئاشکرا کردووە کە داگیرکەرانی ئینگلیزو عوسمانیەکان ئەبینی چۆن رفتاریان لەگەڵ ئەو خەڵکەدا ئەکرد بۆیەپر بەدەم هاوار ئەکات وئەڵێت:ـ

**«لە ڕۆژێکۆ کە یەزدان ئادەمی هێنایە دونیاوە**
**لە هەر قەومێ کە قەومابێ بە قەومی خۆی نەجات داوە**
**کە مێژوو باس ئەکات و حاڵی حازر ئێمە ئەبینین**
**نی یە هیچ کارەسیاتی وا لە قەومی ئێمە ڕویداوە**
**بابا نگی ئاش بە تالی چەرخ هەموو باراشی خۆیهاری**
**لە بەر بێ هاودەسی بار ئاشی ئێمە هەروەها ماوە»** [٩]

(بێدار) نەك هەر نیشتمانی خۆش ویستووە ، بەڵکوخزمەت کردنی هاوزمانەکانی ناو ئەوخاکەشی بە ئەرکێکی پیرۆز زانیوە ئاواتیشی ئەوە بووە دوای مردنی لە خاکی کوردستان بنێژ رێ و تیایا ئارام بگرێت وەکو خۆی ئەڵێت!

**« دەمێ خزمەت بە یارانم بە تەختی خوسرەوی نادەم**
**کە نان و ئاوی بێگانە بە چەشنی دانەو داوە**
**بە ئاهی زێدی خۆت (بێدار) بناڵە تاوەکو ماوی**
**لە خاکی کوردستان بمرە کە ڕوحی کوردی تێکلاوە)** [١٠]

(بێدار)شان بەشانی ئەحمەد موختار لە دەشتی بنکورەی ناوچەی خانەقینەوە دەنگی بەرز ئەکاتە وەو ئەڵێت:

**«ناڵەیێکی زۆر بەسۆز دێ وا لە جەرگم کار ئەکا**
**تێ گەیشتم پر دەم خاکی وەتەن هاوار ئەکا**
**دادو فریادی لە ئێشی صحبەتی بێگانەیە**
**دەردەدارە بۆیە ناڵەی عالەمێ بێزار ئەکا»** [١١]

وەیا ئەڵێت:

**لەرێگای عەشقی تۆدا بمکوژن لام وایە قوربانە**
**بەقوربانی ئەوەم لەم جەژنە قوربانە بە قوربانە**
**بە کەعبەی بۆ نەزانم گەر ئەتۆ تێفکری ئەی گیانە**
**ئەزانی چاوەکەم حوبی وەطەن تێکەڵ بەئیماتە؟**
**لەسەر سفرەی خۆمان ئاوا ، کەدیلی دەستی بێگانەین**
**بە نازو نیعمەتی ئێمەیش ئەژین وا قەومی بێگانە**
**بە تەڵقین زیندووە مردوو، بە بانگی هەڵ ئەسێ نوستو**
**بەشەق گەر تۆ نەبی وریا ژیانت ژانە کەی ژیانە؟**
**کەسی دانا بەدانایی ئەوە نادانە داناکا**
**سیلاحی یەك دڵی پێشخەن عەدو وەك سەگ لەدوتانە**
**دەمێکە تو خەیاڵت هەر لە ئەغیارت ئەدەی (بێدار)**
**زەمانە دەم دەمە وادیارە هەردەم ڕۆژ لە چەرخانە »** [١٢]

(بێدار)یش وەکو شاعیرێکی شۆڕش گێرو ئەمەکدار هانی هاوزمانەکانی ئەدا بۆ دەر پەراندنی ئەو بێگانانە وەکو ئەڵێت:

**« ناڵەیێکی زۆر بەسۆز دێ وا لە جەرگم کار ئەکا**

تێ گەیشتم پڕ بەدەم خاکی وەتەن هاوار ئەکا
دادو فریادی لە ئێشی صحبەتی بێگانەیە
دەردەدارە بۆیە نالەی عالەمێ بێزار ئەکا
بانگ ئەکا ئەی ئەهلی غیرەت باری عسرەت لابدەن
دەوری غەفلەت زیللەتە وافیکری میللەت کار ئەکا
ئەی وەتەن روح و دڵ و گیانت لەسەر دانێم کەمە
چونکە مایەی فەخری ئێمەی کێ لە هەق ئینکارئەکا
لاوی خۆم تۆ بارو فریادت لەدەس خۆت قەت بەرمەدە
ڕۆژی ڕەش پێکەوە بژین کێ دەردی کێ تیمار ئەکا
چەندە دڵ ئێشە (بێدار)دەستی ناچێ ناعیلاج
ڕۆژی سەد نەفرەت لەدیاری ناحەزی غەددارئەکا»[13]

(بێدار)ی شاعیرو مرۆڤ هەر بۆئەودەمەی نەئەنووسی کە تێیدا ئەژیا ، بەڵکو ئاوری لە منالە جگەر گۆشە کانیش ئەدایەوە . . چونکی بە هیوای پاشە ڕۆژی ئەزانین بۆیە هەستێکی کوردانەی بۆدارشتون کە مێشکی منالانی پێ زاخاو بدرێ و هەستی نیشتمانیان پێ پتەوتر بکرێت کە چۆن ئاوو خاکی خۆیان خۆش بوێ و لایان پیرۆز بێت وەکو بنەماڵەی (بێدار) ئەیگێرنەوە ئەم هۆنراوە لایەیەی بۆ (سالح)ی کوری وتووە ئەمەش دەقی هۆنراوەکەیە :

« هەی لایە لایە کۆرپەی نەو جوانم
تازە گوڵ خونچەی باخی ژیانم
وەلایەی کوردی لایەت بۆ ئەکەم
تا باش تێ بگەی وەك من تێ ئەگەم
بە درێژایی شەو هیچ خەوت نایە
غەمێ من هەمە تۆیش لە دڵتایە
هەی لایە لایە ڕۆڵەی نازدارم
تۆ چۆنت زانی من دەردە . دارم
گوێ لەوانەم کە بەڵا هۆشت بێ
مێژووی کوردستان حەڵقەی گوشـ بێ
تۆ بە خێو ئەکەم بۆ یارمەتی خەڵك
بۆ هاوزمانت ئەبێ بتبێ کەڵك
هەی لایەلایە ڕۆڵەی شیرینم
بەو هیوای خۆمە یاخوا بتبینم
هەر کەس بۆ قەومی ڕاستی لێ نایە
وەك کەشتی کون کا خۆیشی تێدایە
لایەت بۆ ئەکەم بەو شەرت بیزانی
بۆهاو خوێنی خۆت قۆچی قوربانی
هەی لایە لایە لاوم لای لایە
لە قۆرتی نەگبەت ڕسکار بوینایە
ڕازی لای لایەت لە دڵ جێگیر بێ
زەبوونی کوردت هەرکات لەبیر بێ
لەگەڵ شیر بیخۆ ئەم ڕاستانە
وەك ماران گازە ئێشی بێگانە
هەی لایە لایە کۆرپەی ڕەنگینم
بۆ خزمەتی گەل خۆزگە بتبینم
ئەتۆ شێرکوڵەی نەوەی‌شێرانی
نرخی وڵاتت زەریف بزانی
ڕۆڵە سەر بەستیت بەرزی وڵاتە
گیان فیدای وەتەن تاج و خەڵاتە
هەی لایە لایە کۆرپەم لای لایە
ئاخ ڕۆژێ زووتر تێکۆشینایە
خەوی غافڵی پیشەی نەزانە
سەودای نیشتمان مایەی ژیانە
هەمیشە تکام لەلای یەزدانە
تۆ بێیتە بەرهەم بۆ قوتابخانە»[14]

**بێدارو شیعری دڵداری**

لە شیعرە دڵ داری‌یەکانی تەنها یەك هۆنراوەم چنگ کەوت لە (شێخ محمد أمین)ی برای شاعیرەوە کە لە وەختی خۆی کاك ئیبراهیم باحەلان لە ژمارە (٢٠)ی گۆڤاری (بەیان)دا بڵاوی کردۆتەوە بەڵام چەند دێرێکی ناتەواوە، وەکو ئەیگێرنەوە ڕەساتێکی دڵ تەزێن کاری کردۆتە سەر (بیدار) ئەویش بەم جۆرە بووە : (بێدار)ی دڵ تەڕو هەست ناسك کیرۆدەی عیشقی ئامۆزایەکی خۆی ئەبێت ، بەنیازی ئەوەی بچێتە خوازبێنی ومارەی کات . . لەگەڵ (شێخ ئەنوەر)ی بر ی لە (بنکووره)[15] وە ئەکەونە ڕێ بەرەو دێی (سەی خەلیل)[16] ، لەرێگادا جار جارێك مەلە (زیقاوڵە)یە بان سەریانەوە هات وچۆئەکات وپڕ بە دەنگ ئەزیقێنێ (بیدار)

ئەڵێت : ئەنوەر برام ئەم مەلە زیقاوڵە ئەڵێی هەواڵێکی پێ یە؟!
هەرلە رێگادا تووشی ریبوارێك دێن و هەواڵی بەشودانی کچە ئامۆزاکەیان پێ ئەدرێت وبەناکامی ئەگەرێنەوە. ئەم کارەساتە ئەبێتە هۆی لەدایك بوونی پارچی هونراوەیەکی ئەمەندە ناسك و نایـاب . کـە بتـوانی شان بە شانی هونراوەکانی مەولەوی و وەلی دێوانەو صەیدی خۆی بنوێنێت ئەمەش هونراوەکەیە :

«فەلەك زەبوونم ، فەلەك زەبوونم
پەی دیتن (لەیل)(خەیلی زەبوونم
شەیداو پەشێوحال وێنەی مەجنوونم
موحەییەر نەدەور چەرخ گەردوونم
عەزمم کەرد وەلای شای نەونەمامان
رووم کەرد نە بارگەی گوزەرگای خێلان
هەرچەن مەپرسام چە رابواران
بدو بە دەستم خەبەر چەیاران
یەکێ چە تەیران بەرووی حەواوە
خێزاو ستێزا ئاما چ لاوە
بە ئاواز مەوات دەروون پڕ خەخار
مەگێلۆ سەحرا پەی دیدار یار
جەفات بێ سەفان خاکت بۆ وەسەر
یە خەیلێ وەختەن عێل کەردەن گوزەر
نەزانام ئازیز کۆچش کەردەبی
ئای بەدبەخت وێم کۆچش وێردەبی
ئازیز تۆ لوای کۆچ خەیرت بۆ
من مام پەی سزای جەفای دەرد تو
بەوێنەی مەجنوون لەیل گوم کەردەبو
هەر لەیل لەیلمەن چ پای کەژو کۆ
پەی گەردن ساغ مینا ئاسای تو
پەی کۆکای زولفان دەور گۆنای تۆ
واوەیلا کۆچ کەرد نەو نەمام نو
قومری نەشاخان تەیران نەداخان
ماتەمەن پەرێ شای بەرز دەماخان
بولبولان چە شاخ گوڵاو نۆششان بۆ
تازیە شانەن پەرێ بالای تۆ » [١٧]

بێدارو شیعری کۆمەڵایەتی :

لە شیعـرە کۆمـەڵایـەکـانی تەنها دوودێرم دەست کەوت تیایانا روو بە رووی مەلاو واعیـزەکـان بوتـەوەو رەخنەی توندوتیژ ی ئاراستەی برێکیان کردووە (بێدار)هەر چەند خۆیشی مەلایەتی کردووە ، کەچی داش بەزیـوەتـە سەر مەلاو واعیـزەکان کە هەر رابردوو ئەگێرنەوەو ئاورێك لە سەردەم و داهاتوو نادەنەوەو ئەڵێ :

«قسەی (واعیظ)لە گوێ ناکەم لە رێی ژینا وونی کردم
بەحیلە چاوی بەستم گۆشسە گیری قوژبنی کردم
لە خۆیوە ژینی پێشان دام چەژینێ ژینی حەیوانی
لە دەرسی (مەعریفەت)هەر فێری خەونوو خواردنی کردم» [١٨]

وەکـوتمـان (بێـدار)لـەمـاوەی ژ یـانی دا پەیـوەنـدی بە گەلێ زانـایانی دینی و ئەدەب دۆستانەوە بووەو لە دڵیان دا ژیاوە ، بۆیە دوای کۆچ کردنیشی لە یادیـان نەچـووە ، یەکێك لەوانە (مەلا ئەحمـەدی دەکـە) [١٩] یەکە پارچە هەڵبەستێکی نایابی داناوە بە بۆنـەی کۆچی دوایی (بێـدار)ەوە ، لەبـەر گرنگی هەڵبـەستەکە حەزم کرد دەقی هۆنـراوەکـەو وێنـەی دەسنوسەکە بخەمە پێش چاوی خوێنەرانی ئازیز ئەمەش هەڵبەستەکەیە :

« تاریخی وفاتی مرحومی شیخ بابا علي غفر له» [٢٠]
دەردی سمومی مەرگە لە باغی شەرافەت بری نەمام
وەختی تەمموزە کوچی عەزیزە برا عەقڵ و فام
داغی خەزانی گوڵی گوڵشەنی فەرەح نرابە دەماغ
بولبول خەفینە ماتەمینە لە شینە هەموو سوبح و شام
باباعلي بنێرەی ئیمامی عەلی بە فەزڵ و ئەدەب
بەکەسب و راستی تەوەککل گەیشتە حوسنی ختام
ئەسڵی شەجەرەی سلسلەی سابتە دیارە لە بیارە
کتێبی (نورالانوار)ە بەیانیان ئەکا بە جددی تەمام
لە (پیر یونس )و ئەهدەل شازلی هەتا ئیمامی حەسن
نەسەب (حسن )ی هەمو وعولەماو ئەولیاو زوواتی کیرام
دەردی وەفاتی زەحیرە لە بەغدا وەبێ کەس و غەریب
(لیلەالقدر)و جومعە بیست و حەوت ئەشرفی ئەییام
هەر یەك لە مانە روتبەی عالی یە دەرەجاتی شەهادەتە
(الحقنا) [٢١] ئایەتی دەرەجاتی زوررییەتە وەکو جدودی عیزام

**نیدای (ارجعي[22])هاته سەر ڕوحی ڕۆیشتە جیتان وجوودی لە بنکورە لای باب و مامی گردی مەقام**

مایـەوە بڵێین (بێـدار)ی نیشتمـان پەروەرو شاعیر ئەو دڵەی کە پڕی بوو لە خۆشەویستی خاك و ئاوی کوردستان، لە (٢٢)ی تەمـووزی ساڵی (١٩٤٩) [23]لـە شاری بەغدا لە لێدان وەستا ،لـە نەخـۆشخـانەی (دارالسلام)بە نەخۆش زەحیری کوچی دوایی ئەکات و تەرمە ساردو سرەکەی ئەهێننەوە بۆ دێکە خۆیان و لەسەر وەسیەتی خۆی لە گۆرستانی (ئیمام سەرپەتی ) [24]بە خاکی ئەسپێرن و لەوێ سەری یەك جارەکی ئەنێتەوە.

لە کۆتـایی دا هیـوادارم توانیێتم تا رادەیـەك (بێـدار)ی شاعیر، شۆرە سواری مەیـدانی شیعـری نیشتمـانی بەئیـوەی بەرێـز بناسێنم لەگەڵ سلاوم دا بۆ گیانی پاکی شاعیر.

* پەراوێزو سەرچاوەکانی ئەم باسە*

١- بروانە گۆڤاری بەیان، ژمارە (٢٠)ساڵی ١٩٧٤، ل٥

٢- بروانە پاشکۆی ڕۆژنامەی العراق ، ژمارە(٦)ساڵی ١٩٧٧، ل٧

٣- گونـدێکـە سەر بەنـاحیـەی قۆرەتـو قـەزای خانـەقی لەو ناوچانەدا بە (دێ)ئەڵێن (ئاوایی)

**٤- هەمان ژمارەی پێشووی گۆڤاری بەیان، ل ٥.**

**٥- برای شێخ بابـا عەلی(بێدار)وتەمەنی لە (٧٠) ساڵ تێپەڕیوە وەکـو من پێـی بزانم ئەمیش دەستی شیعـر وتنی هەیـە، گەلێ لە شیعـرەکـانی (حـافـظ) و(سـەعـدی) لە بەرەو، بە کوردیش مانـاکـەیشی ئەکـاتەوە. . لە قسەکردن دا زۆر لە سەرخۆو بە تام و لەززەت ئەدوێ، کە ئەچێتـە لای بۆگفتـوگـۆ حەزنـاکـەی بە جێی بێلێ، هیوادارم گفتوگۆیەکی تایبەتی لەگەڵا بکەم دەربارەی ژیانی و شیعرەکانی.**

٦- مەبەست لە (ئاوایی گەورە)یە

٧- بڕوانـە عەلائـەدین سەجـادی، مێژ ووی ئەدەبی کوردی، چاپی یەکەم ، بەغدا، س ١٩٥٢، ل. ٥٥.

٨- بروانـە پێشـەکی دیوانی جەفایی کۆکردنەوەو لێ دوانەوەی ،محـەمـەد عەلی قەرەداخی ، چاپخـانـەی شەفیق ، چاپی یەکەم، بەغدا ، ١٩٨٠

٩- لە شێخ (محەمەد أمین)ی برای شاعیر وەرگیراوە

١٠- سەرچاوەی پێشو

١١- پاشکۆی ڕۆژنامەی العراق ، ژمارە (٦)س ١٩٧٧ ل ٧

١٢- بروانە ژمارە (٦)هەمان پاشکۆی العراق، ل ٧

١٣- بروانە ژمارە(٦)هەمان پاشکۆی العراق ،ل ٧.

١٤- گۆڤـاری گەلاوێـژ ، ژمـارە (٢)شـوبات ١٩٤٤ ، سالی پێنجەم ،ل ٣٤-٣٥

١٥- هەرێمێکـە پێـك هاتـووە لەچـەن دێهـاتێـك جێ نشینی هۆزەکـانی تاڵـەبـانی و جمـورو باجـەلانە، ئەکەوێتە ژووری شاری خانە قینەوە.

١٦- گوندێکە بە شەش کیلۆ مەترێك ئەکەویتە ژووری شاری کەلارەوە

١٧- ئەم پارچــە هۆنـراوەیـەم لە شێـخ (محمـد أمین)ی برای شاعیـرەوە دەس کەوت، ووتی هۆنـراوەکـە لەمـە زۆر ترەو هەر ئەوەندەیم لەبەر ماوە.

١٨- ئەم دوو دێرەم لە شێخ (محمد أمین)وەرگرت

١٩- خواڵێخـۆش بووی ناوبـراو زانـایـەکی دینی تێ گەیشتوو ناسـراوی ناوچـەی خانـەقینـە، مەلا ئەحـمـەد پەیوەندی یەکی پتـەوی هەبـووە لەگـەڵ (بێـدار)دا، لە مەیـدانی شیعـریش دا دەستی هەبـووە جێی داخـە تا ئێستـا شتێکی ئەوتۆی لە بارەوە نەنووسراوە بەخوێنەران بناسرێ

٢٠- ئەم پارچـە شیعـرەم لە ئەنـدازیـار (سعـد الـدین محمد أمین)ەوە دەست کەوت کە برازای (بێـدار)ە، شیعـرەکـەم بە ڕێنووسی ئێستای کوردی نووسیوەو چەن وشەیەکیش لەدێرێکا بۆ نەخویندرایەوە خالم بۆ داناوە.

٢١- نووسەری شیعرەکە ئەمەی بە پەراوێز بۆ داناوە (الحقنابهم ذریاتهم)

٢٢- نووسـەری شیعـرەکـە ئەمـەی بە پەراوێز بو داناوە (یاأیتها النفس المطمئنة ارجعی الی ربك راضیة مرضیة)

٢٣- بروانە ژمارە(٢٠)ی گۆڤاری بەیان س ١٩٧٧، ل ٦

٢٤- گۆرستانێکە نێزك بە دێکەی خۆیان و ئەکەوێتە ڕۆژئاوایەوە

# پێداچوونەک

نڤیسینا: شعبان مزیری

کومەلا کورتە چیروکا ئەوا ل بن ناڤ ونیشانێت (سمفونیا کاروانیا)یاچیروکنڤیس (عبدالله جندی)پێك هاتی‌یە ژ(۹) نەهـ کورتە چیروکا.

چیروکنڤیسین هونەرەکە ژهونەرێت نوری یێت ب زەحمەت، خەم ژێ خوارن ئو وەستیان یا پێدڤی‌یە دڤێ کومەلا چیروکادا مروڤ دشێت بیروهزرێت چیروکنڤیسی بزانیت ئو ل سەر هلبیت.

ئو کانێ چەوا دهونەرێ چیروکێ دگەهیت چونکو چیروکێت دئەڤێ کومەلێدا هەمی ئەوی یێت ل بەرپەرێت روژناماو کوڤارا بەلاڤەکرین ئو پشتی ژێ رازی بوی. . یێت خرڤەکرین وەکو پەرتوك ئێخستە بازارێ.

چیروکا«سمفونیا کاروانیا»

چیروکا سمفونیا کاروانی‌یا چیروکەکا سەرکەفتی‌یە چیروکنڤیسی هەولدایە رابیت ب کارهینانا مژو مورانێ داخزمەتا رامانا وێ بکەت یا ئەری دڤێت. . دڤیا ژیانەکا نوی پەیدابکەت ل دویڤ هەر وێرانکرنەکا پەیدا دبیت بونا زاروکی دڤێ چیروکێدا نیشانا ژیانەکا نوی‌یە کەفتنا دیواری، دویماهیك هاتنا قوناغەکێ‌یە. .

ژقوناغێت ئەڤێ ژیانێ هەروەکو دبێژیت «واقە واقا بجویکی مە گولێ بوی وژی سەرای بوی مە هند دیت طلێ ژێریێ خانی هەرفت ل «۱۳» ل ژلایەکێ دیڤە کوتر نیشانا ئاشتی یێ‌یە. . بەلێ زیزبونا وان، ئالوزی‌و نەخوشی ئو تەعلاتی‌یا ژیانێ هەر یاپەیدایە. . هەرچەندە ئەو بخو ژی دیارناکەت کانێ دەهێ فرین. ترانێت دێ مزگینی‌یا ئاشتی یێ یان جەنگێ دگەل خوبەن. . هەروەکو دبێژیت.

«کوترێن مە ژی ل مەزیزبوون، ئەوان ژی نەرازی بوونا خوه خویاکر، ئینا ئەوژی فرین، فرین فرین هندی چاڤێت مە قەتره دکر بەرەئەڤراز دفرین، لێ ئەوابویە کەسەر ددلێ مەدامە نەزانی دێ‌کیژ مزگینیێ دگەل خوه بەن»۱۳

تشتی نەشیرین دڤێ چیروکێدا ئەوە گەلەك زێدە پربێژی (حەشو) بکارهینایە. . چ تامێ تێدانا هێلیت. . ژتاما چیروکێ دەردکەڤیت هەروەکو یادیارە ل دەست پێ‌کاوێ . . چیروکنڤیس هونەرمەندە. . جیهانا وی‌یا تایبەتی‌یە دویرە ژکەلەخێت حازر. . خو نێزیکی کەتوارێ گشتی دکەت. . هەروەکو هونەرمەندی‌هەولددەت بابەتێ خوجوان رێکبێتخیت ئەوژی ل دویڤ دیتنا وی یاهونەری . . ئەوا ل دەڤ وی ل درێژی‌یا سالێت ژیانا وی پەیدابوی.

## چیروکا شیرین

بابەتێ چیروکا شیرین . . بابە تەکێ گەلەك مشەیە دناڤ جڤانامەیا کوردەواری هەرچەندە چیروکنڤیس هەولدایە چارەسەریەکێ بو گرفتاریا جیاوازیا هەی دناڤبەراکچك وکورکادا هەی پەیدابکەت . . دبێژیت گەلەك ئاخفتن ژدەڤ کچکێ . . بو وێ نەباشیە گەلەك ئاخفتن دێ بیتە بەنشتێ دەڤێ خەلکی . . هەروەکو دبێژیت :

«شیرین بیوە بەنیشتێ دەڤێ خەلکێ تاخێ و هەڤالێن وێ ێێن خاندنگەهێ . . روژ بو روژێ ئاخفتن شارهایتر لێ دهاتن و قەسێن پروپویچ ل زێدەیێ ددان . . »ل ١٧ هەتا دبێژیت «چ جهێ جوبایێ بەحسێ وێیە وێ کەسێ دینە ، »١٨

دسەرهندێ را(شیرین)یا دوودلە . شەرەنیخەکا درونی ل دەڤ پەیدابویە . . نزانیت چ بکەت خو بکوژیت . . ناڤێ وێ لەوتیە (عوزر ژڤوبحەتێ)مەزنترە . ل سەر هندێ را ژێ یارازێ نینە ، مرنا هوسازێ یاخەلەتە .

«ئەز خو ناکوژم دابەلا من ژخەلکی ڤەبیت وئەز ژێ تەنابیم»!! ل ١٩

نەء . . نەء ئەڤ مرنا هو ژێ یاخەلەتە . . »ل ١٩

ژبەرهندێ ب دەنگەکێ بلند دبێژیت دڤێت ئەڤینەکا مەزن دروست بیت ، جڤاتەکا نوی ئاڤا بکەین . . دیوارێ کەڤن بەهەرفیت دا جوداهی لناڤبەرا کچ و کوراا نەمینیت . .

هەروەکو دبێژیت . . «دڤێت ئەڤینەکا مەزن دروست بکەت لناڤبەرا خومو هەمی خەلکی ، جڤاتەکا نوی ئاڤابکەت ، وی دیوارێ پەحن و بلندبهەرفیت ، وێ جوداهیێ نەهێلیتن لناڤبەرا کچێ و کوری»ل ٢٠

بەلێ مخابن هیڤیێت وێ بجهـ نەهاتن دنیا لێ بو ڤەلپوچکێ کەزانێ کەنی وگری تێکەلیێك بون . (هێستریا)یەکێ گرت .

چیروکنڤیس دڤێ چیروکێدا وەسا دیاردکەت ڤەگوهازتنا رویدانێ ژدەڤ شیرینێ . ئوزیرەڤانیا خەلکیء بو پربێژیو گەنیو سوحبەتا وێ دگەل خەلکی . . وەلێ کرهەتاکوگەهاندیە شێت بونێ . . ئەڤەژێ درڤریتە سەروبەرێ جڤاتێ ئو ئەو جڤاتا ئەو دناڤدا دژیت .

## چیروکا جڤان

بابەتێ چیروکا جڤان دناڤ فیلم و وزنجیرێت زارڤەکرنێ یێت میسری داگەلەك بەلاڤەیە بیت چیروکنڤیس پێ داخبارییت . کورتیا وێ چیروکێ دبێژیت کولیزار کچکە . خو ل هیڤیا دەزگرێ خو دکرێت (لزگین)ئەوێ چوویەژ دەرڤە . . بەلێ پشتیدزڤریت دبینیت دەزگرێ وێ ژتکەکا بوخوهیناێ . . »

دڤێ چیروکێدا کولیزار گەلەك ئەزیەتێ ئاخفتنا دبیت بەلێ ئەو ئەوان ئاخفتنا هەمیا دادعویریت ژبەرخاترا چاڤێت لەزگینی . «گولیزار . ئاگولیزار تەبو من ئاڤ گەرم کریە؟ ! ا«ئەڤەیە تە دڤێت هوسایە وتە نەڤێت ژێ رێکا بیەر تەڤە بو خوە شویکە ، هندیتولڤێ مالێ ڤەبی ئەڤە حالێ تەیە وشولێ مالێ ژێ هەمی ل سەر ملێن تەیە . . »ل ٣٧

## چیروکا شەڤا ئەردی دێ هێت کوشتن

دڤێ چیروکێدا پربێژیەکا (حەشو)یاژقامێ دەرکەفتی هند یێ پێدا چووی هەتاکو ژرەنگێ چیروکێ دەرکەفتی . . هەروەکو دبێژیت :

«بەفر ژێ مینا نیشانەکا دێریناچیا دڤێت خویاکەت کوهەر ئەوە خەملا وان چیا ، هەر ئەوە دبتە ئاڤا کانیاو دبتە رویبار ، دەریا ، ئوقیانوس . هەر . هەر . هەر . هتد»ل ٤٤ درێژکرنا چیروکێ جوانیا وێ یا گرێت کری نەخاسمە ل دەمێ دان و ستاندن دناڤبەرا دایکا مەتینی ئو هەرسێ زەلاما پەیدادبیت ب هزرا من ئەو دان وستاندن یازێدەبو . هەکە نەبا دا چیروك جوانتر بیت ئو یا زانایە هندی دان وستاندن یاکورت بیت جوانترە ئو دڤێت ئەو دان وستاندن یاتژی خو بیت هەروەسا ژخاسیەتێت چیروکا کورت ئەوە کەسێت وێ کێمن ئەوەکو رومانیە . ڤێجا بابەتێ ئەڤێ چیروکێ یێ رومانیە نە کورتە چیروکێ هەرچەندە چیروکنڤیس دەرچویێ پشکا کوردیە ئو بکالوریوس ب تورو زمانێ کوردی

وەرگرتی‌یە . . ئو سەیدایێ زمانێ کوردی‌یە ل سەر وی پێدڤی بۆ خو رزگاریکەت ژخەلەتێیت رێزمانێ ئو بزانیت کانێ جهێ فعلی ل کیـرێ‌یـە . ژبـەر هنـدێ نوکـە دێ هنـدەکـا دەست نیشانکەم

نڤیسی‌یـە «ئـەز دێ چم درەنگـەلمن . . بەلێ تو ئێمـانـەت ـ مەتین»ل٤٧ یـادروست تر«لمن درەنگـە ئەز دێ چم . . بەلێ

ئێمـانـەتی‌تـە مەتین)نڤیسی‌یـە : «دەست ب حەیـرا نۆکا کربو کوڕی»ل٤٧ یادروست تر : «بـوکـوڕی ، یان «بـۆکوڕێ خۆ دەست ب حەیرانۆکاکر . . »

نڤیسی‌یـە «یـامـژویلە دژوورڤـە ب شولێ مالێڤـل»ل٤٨ یادروست تر : «یادژوورڤە ب شولێ مالیڤەمژویلە» نڤیسی‌یە «ئێ ئەو کی‌یە ئەزا هاتم»ل٤٨

چ رامان ژێ نینە . . یا دروست تر .
«ئێ ئەوکی‌یە ، ئەز ئەڤە هاتم » .

نڤیسی‌یە«چاڤێن وان زیق بوون دسەریرا»ل٥١
یادروست تر«چـاڤـیـن وان دسـەرێڕا زیـق بوون»نڤیسی‌یە : «ئیشلاچ ب سەری نەهاتە»ل٥٣ یادروست تر «ئیشلاچب سەری نە هاتی‌یە» . نڤیسی‌یە : «کەلا گری خۆ»ل٥٩

یادوست تر : «کـەلا گری‌یێ خۆ»نڤیسی‌یـە : «گڤـاشتیا دەڤمی کورەماری دا کوریاخۆ ل تانی دەت»ل٥٩

کورد دبێژن : «گڤاشتبا دەڤێ کورەماری(ماری)دارەق بیت» نڤیسی‌یە : «دەیکا مژی لمن نەبتە خودان لڤی دنێ ، »ل٥٩

دروسـت تر : «رایـکـا مژی لڤـێ ونـێ لمـن نەبـتـە خودان)نڤیسی‌یـە : ئەڤ ئوتـومبێـلا پێ کری‌ل٦٩دروست تر : «ئەڤ ئوتومبێلا یا پێ کری»

چیرۆکا مێڤانێ موغبەرێ

ئەڤ چیـرۆکـە ب دان وستـانـدنێ دەست پێدکـەت . . دان وستـانـدن هەرچـەنـدە زیـرەکی ئو شەهـرەزایی پێ دڤێت . . ئـونـاڤـەرۆکـا چیـرۆکێ دخەملینیت و ب هێـز دکەت ئو دهێلیت خاندەڤان لەزەتێ ژێ بینیت بەلێ هەکە چیرۆکنڤیس نەشیـا دەستێ خۆ بدانیتـە ل سەر رێڤەیرنا دان و ستاندنێ دێ

لەوازی‌یێ ئێخیتـە چیـرۆکێ هەروەکویادیارە دچیرۆکا (شەڤا ئەردی دێ هێتـەکـوشتن »لاپـەرێ(٥٠-٥١)دەست پێکـرنـا

چیـرۆکێ ب دان وستـانـدنێ‌یـە ئەڤە یادیارە دچیرۆکا مێڤانێ موغبەرێ)ئو (کادەیکا من)چیروکنڤیسی یێ تێداسەرکەفتی بۆ . .

پەیڤا دویماهیکێ

باراپتـر ژچیـرۆکێت ئەڤێ کومەلا کورتە چیرۆکا ناڤەرۆکا وان هاتینـە وەرگـرتن ژکـە تواری ئوپیك هاتینە ژدیمە نێت رۆژانە

ئەوێـت کەڤـتـینـە ل بەرچـاڤـێـت چیـروکـنـڤیـسی هەروەسـاچیـرۆکنڤیس داخبـاز بۆیە ب سەروبەرێ ژیانا خۆ

یارۆژانـە . ئـو ئەو ملمـلانا رۆژانە یا ژیانا خەلکی . . ل ناڤ تاخ و کولانێت ئەولێ دژیـا هەمی خرڤـەکـرینـە ئوکرینـە کەڤالێت جوان چیرۆکێت خۆپێ خەملاندینە هەروەکویادیارە

دچیـرۆکـا (کـادەیکـامن)(شـەڤـا ئەردی دێ هێت کوشتن )(شیـرین) (خـەلاتێ) زڤستـانـەکـاسار) . . ئو هەروەکو من

گوتی (دچیـرۆکـا (شیـرین) ، (جڤـان ) ، (داخبـاربـویە ب فیلمێت میسـری ئو ئەڤ بایـەتە گەلەك دبەلاڤەنە . . نەهەوچە بۆ ئەوی دوپارە کربانەڤە .

چیرۆك

# سمتانه

د. مارف خەزنەدار

خانــووی حاجـی ئاغــاله سەر گردێکی بڵنــد بوو لە قەراغ گوندەکـە دانیشتـووانی گونـد و دەوروبـەرناویان نابوو قەڵای حاجی ئاغــا ئەوی ڕاستیش بێ ئەوە بوو لە دیــوی پشتـەوەی گردەکـە شوێنەواری شوورەی قەڵای دێرین تا ئێستا ماوەتەوە، دەڵـێــن قەڵا ی نوختــەی پاســەوانـی بووەلــەســەردەمـی ساسانی‌یەکانەوە تا ڕۆژگارانی عوسمانی ، گۆیا لەوێوە سەرباز وجەندرمە باسی دەوزێ وناوچەکەیان کردووە .

خانـووی حاجی ئاغـا لە لای دەستـە چەپـەوە دەیروانی‌یە گونـد ، ئەمـە بەقـەد لێژایی ێیکەوە بوو، تا دەهات بەرەوخووار دەبـووەوە ومـاڵەکانیش تا قەراغ زێ دەکشان ولەگەڵ ناعووری تووتنەوانەکان تێکەڵ دەبوون .

حاجی ئاغـا پیـاوێکی بە ساڵا چووبوو، نەخۆش بوو، دەردی گران بوو، زەبــروزەنـگـی دەوری لاویــەتـی کز بووبوو، لە سەردەمــی ڕابــردوودا بەدەســت و بازووی خۆی هەرچـــی بویستایە دەیکرد، بەڵام لەم سەردەمەدا تووانای ئەوەی نەمابوو لەمـاڵ بێتـە دەرێ لەبـەر ئەوە کاروباری بەڕێـوە بردنی گوندی دابــووە قادر ئاغـــای کوڕە بچـــووکی ، چونکــە دایکی کوڕە گەورەی ئاغازادە نەبوو.

ئێــواران لەســەر سەکــۆی بەردەم ماڵی خۆیــان نوێنیــان بۆ ڕادەخست ولە سەری ڕادەکشا . لە ماوەی نێوان نوێژ ی عەسرو شێـوانیش دا خەڵکی ڕوویـان دەکـردە قەڵای حاجی ئاغا، بۆ هەواڵ پرسینی و پشووێیکیان لەوێ دەدا .



خەڵکی گوند هەموویان دەیانزانی ئایینی تایبەتی لە مەجلیسی ئاغـا دا هەیـە، بەوەی خەڵکـەکـە ، تەنـانەت منداڵ و هەرزە

دەبوو لەسەر ئەژنۆ دابنیشن ، هەروەها نەدەبوو کەس لە لای دەستە چەپی حاجی ئاغا دابنیشێ چونکە ڕووی دەکەوتە لای دەستە ڕاستی‌یەوە ، ئەمە لەبەر ئەوە بوو کانی‌ی ژنان کەوتبووە لای دەستەڕاستی قەڵای حاجی ئاغاوە . کە ژنان بۆ سەرکانی دەچوون لە ماڵی حاجی ئاغاوە دیار بوون . کە لە کانیش دەگەڕانەوە وەکو بەرەو ڕووی ماڵی حاجی ئاغا بێن وابوو ، بەڵام لەبن گردەکەوە پێچیان دەکردەوە و دەچوونە ناودێ .

کەس نازانێ ئەم ئایینە کەی دروست بووە، تەنیا خەڵکەکە ئەوەندە دەزانن لەوەتەی حاجی ئاغا هەیە کەس لە دیوەخانەی سەرسەکۆی ئەو بە شێوەیێکی وا دانائیشێ کە ڕووی بکەوێتە کانی‌ی ژنانەوە، مەگەر کەسوکاری نزیکی حاجی ئاغا نەبێ لە ئاغازادەکان و هەندێ کوێخا و تووتنەوانی پیری ڕزیو هەر کەسێکیش ئەگەر بۆیەکەمین جار ڕێی بکەوتایە ئەم مەجلیسە هەموو شتێکیان تێ دەگەیاند لەم بابەتەوە .

ئەو ئێوارەیە حاجی ئاغا هەستی کرد کە لەشی ساغە ، لە بەر ئەوە نەخۆشی‌ی لەبیر چووبووەوە ، شتی وای کەم بەخۆیەوە دەدی ، لەبەرئەوە ڕووخۆش و دەم بە پێکەنینی بوو، قسەی خۆشی لەگەڵ پیاوەکان دەکرد و بە گاڵتەوە جنێویشی بە مێردمنداڵ و هەرزەو لاوەکان دەدا، بەوەی بێ تووانا وترسنۆکن هەرچی ئەویشە لەکاتی خۆیدا عەرش و قورش لە بن پێی دەلەرزین و باڵندە بە بێ فەرمانی ئەو نەدەفڕین!

ئیتر بەهۆی ئەوەی ئەو ڕۆژە تەندروستی باش بوو، لە هەموو کەسێك زیاتر قسەی دەکرد و زۆریش دڵخۆش بوو، بەڵام لەپاش ماوەیێك دانیشتووانی مەجلیس هەستیان کرد کە حاجی ئاغا خەریکە بەرە بەرە سارد دەبێتەوە، بزە وپێکەنین لەسەر لێوەکان و دەم و چاوی کەم دەبنەوەو زیاتریش هەوڵ دەدا کە دانیشتووان قسە بکەن و ئەو گوێ بگرێ پەیتا پەیتا ووردە ئاووری لەلای دەستە ڕاستی دەدایەوە بەڵام دیارە کەس نەبوو ئەوەندە ئازا بێ بتووانێ ئاوورێك لە پشتەوەی بداتەوەو تەماشای ئەو لایە بکا کە حاجی ئاغا ڕووی لێ کردبوو . خۆی خووار دەکردەوەو سەری بڵند دەکرد وملی دەخوراند، هەموو هەڵسوکەوتەکەی ئەوەی دەگەیاند کە شتێکی نا ئاسایی لە لای دەستە ڕاست لەخووارووی قەڵای حاجی ئاغاوە هەیە

لەناو ئەم مەجلیسە گەورەیەدا لەحاجی ئاغا بەولاوە کەس نەیدەزانی ڕووداوی لای دەستە ڕاستی قەڵای حاجی ئاغا نائاسایی‌یە . هەرزەو لاوی کەپشتیان لە شانۆی ڕووداو بوو هەرگیز زاتی ئەوەیان نە دەکرد ئاوور بدەنەوە، هەرچی پیرو بەساڵاچوو و ئاغازادەکانی کە ڕوویان لە شانۆکە بوو، هیچ شتێکی نائاسایی نەکەوتە بەرچاویان ، بەڵام هەمووشیان هەستیان بە نارەحەتی حاجی ئاغا کرد .

ئیتر کات درەنگ بوو، بانگی شێوان نزیك بووەوە، خەڵکەکە یەك لە دووای یەك خواحافیزیان لە حاجی ئاغا کرد، بەڵام ئەو هەموو بیرو هۆش وهەست ونەستی لای دیمەنی دەستەڕاستی ماڵی خۆیان بوو، لەپاش ئەم هەموو پێش خواردنەوە وتەنگاو بوون وگوڕرانە سایکۆلۆجیانەی بە سەر حاجی ئاغادا هاتن ، بڵحە بڵحێکی لێوە هات ووتی : فایدەی چی تازە تەواو ، خوا دەزانێ جارێکی تر دەیان بینمەوە یانا؟!

ئەو شەوە تا بەیانی خەو نەچووە چاوی حاجی ئاغاوە، ئەم لاو ئەو لای دەکرد، نوقمی ناوگێتی‌ی خەیاڵ بوو بوو و لەگەڵ دەروونی دەدوا : بۆچ یەکسەر لەمەسەلەی نەکۆڵی‌یەوە؟ بۆچ ئەلە چەوتەی نەنارد؟

با خەڵکی دابنشتین ئەو لە هەموو ژیانی‌دا هەرچی کردبێ بە دزی نەیکردووە، هەموو شتێکی ئاشکرا بووە ، هەموو کردەوەیێکی لە پێش چاوی خەڵکی بوو! بەڵکوسبەی ودوو سبەی وجارێکی تر ئەو کارە ڕووی نەدایەوە!

ئەم وەرەووڕد و لێکدانەوانە خەریك بوون مێشکی حاجی ئاغا بتەقێنن بەڵام بڕیاری دا واز لەم مەسەلەیە نەهێنێ ، ئیتر کەوتە پیلان دانان بۆسبەی و دووسبەی تا دەگاتە ئامانجی خۆی.

حاجی ئاغا باش دەیزانی سەر لە بەیانیان وکاتی چەشتەنگاو و ئێواران نێوان بانگی عەسر و بانگی شێوان بەگشتی ژنان دەچن بۆ سەر کانی بێ گومان هەرکە چاوی پێیان بکەوێ ، دەست بەجێ دەکەوێتە لێکۆڵینەوە، جا ئەوە گرنگ نی‌یە بەیانی بەیانی ڕوو بدا کە بە تەنیا لە ماڵەوەیە یا ئێوارە بێ کە خەڵکی لای دەبن لە دیوەخانەی سەرسەکۆ.

بۆ بەیانی حاجی ئاغا تا نزیك نیوەڕۆ لەسەر نوێنەکەی پاڵ کەوت ، ڕووی کردە لای دەستە ڕاستی و دەبڕ ووانییە ڕێی کانیی ژنــان . تــووڕە بوو بوو ، دەمی کەفی کردبــوو، کەس نەیــدەوێــرا لەپێستی خۆی بجــوڵێتــەوە . هەروەهــا لەخەڵکی ماڵــەوەش کەس زاتی ئەوەی نەدەکرد پرسیارێك لەحاجی ئاغا بکا، کردەوەی وایان لێ نەدی بوو، سەریان سوڕ مابوو لەوەی کە سەرلــە بەیــانی لە دیــوەخانەی سەرسەکۆ پاڵ بکەوێ . ئەو ڕۆژەش دنیا هەندێ گەرم بوو. پێش نیوەڕۆ حاجی ئاغا ڕووی کردەوە ناو ماڵ ، ئەو ڕۆژە زۆر بێ دەنگ بوو، قسەی نەدەکرد، کەسیش نەیــدەوێــرا قسە بکا لەترسی داگیرسانی هەرا ، بەڵام هەموو کەسێك دەیزانی شتێك لەناوەوە هەیە .

ئێــوارە مەجلیس گەرم بوو، خەڵکــەکــە هەستیــان بەوە کردکــە حاجی ئاغــا تەنــدروستی باشــە ، بەڵام تەنگــوچــەڵــەمــەیێك چرنــووکی لەمێشکی گیــر کردووە، خەڵکەکە هەمووبیریان لە حاجی ئاغا دەکردەوە، ئەویش چاوی تەنیا لە ڕێی کانی ژنان بوو ومێشکیشی لای ئەو دیمــەنــە بوو کەلــە ڕۆژی ڕابــردوودا چاوی پێی کەوت لەپڕ زیرە لە حاجی ئاغا هەڵسا!

ـ بە زاتی خوا خۆیانن!

سەری وەرگێڕا و ڕووی کردە دەرگای ماڵی خۆیان وبە دەنگێکی بەرز هاواری کردە خزمەتکاری تایبەتیی خۆی:

ـ ئەلە . . ئەلە! . . وەرە زووکە!

ـ بەڵێ قوربان

حاجی ئاغا دەستی بۆ سەر ڕێی کانیی ژنان درێژ کردو ووتی:

ـ ئەم دوو کچە دەبینی چۆن وەکو قاز دەڕۆن و زۆر لەخۆبایین!

ـ بەڵێ قوربا ن .

ـ دەبڕۆ بزانە کچی کامە ناجسنێکن وابە فیزەوە دەڕۆن ووەکو لە خۆیان گەورەتر لەم ناوەدا نەبێ! .

ئەلە چەوتە چووە سۆراغی دووکچەکە وحاجی ئاغاش کەوتە باسیان:

ـ من نەمــدیــوە کچــی چووارده پازده ساڵــی وابــێ پەروا بێ ، کچی خڕ و پڕوجووان ، بەم جۆرە خۆیان با بدەن لە ڕێگەی کانی جەرەی سەر شانیــان لە شەوقی ناز وفیــزیــان بلەرێتەوە، ئەنگوچکیان لە سەرقوڵ و باسکیان بترازێ!

کابرایێکی پیری بە ساڵا چووی تووتنەوان ووتی:

ـ قوربــان لە سایــەی خوا و ئێــوەوە، خۆپیــاوهەر نی یــە بتوانێ ئاوڕیش لە ڕێی کانیی ژنان بداتەوە ، لەبەر ئەوە بێ شەرعی نی یە ژنان لە نێوان خۆیان دا هەرچی بکەن.

ـ بەڵێ ڕاستــە ، بەڵام هەمــوو شتێــك سنووری هەیە ، بۆچ لە ڕەوتیــان دائــم سمت و کەفەڵە گەورەو جووانانەیان با دەدەن ، ئەمە بێ شەرعی نی یە؟

هێشتــا حاجی ئاغــا قسەی تەواو نەکرد بوو، ئەلە چەوتە هاتەوە ، بە هەڵکە هەنسکێ ووتی:

ـ قوربــان! ئەمــانــە یەکێکیان کچی هەمزە ئاغای نەوەی عەزیز ئاغای مامی باوکتە ، ئەویتریان کچی مچەی شەریفە!

حاجی ئاغــا تووڕە بوو ، دەمی تێــك ئاڵا ، قسەکانی پچڕپچڕ بوون ، نەیــدەزانی بڕیــاری چی بدا، لەبەر ئەوە هەر سەری با دەدا وبڵمە بڵمی دەهات ، بەڵام دیار بوو بۆبڕیار دەگەڕا . ئەلە هەر بەپێوە وەستا بوو. خەڵکەکەش چاوەڕووانی قسەی حاجی ئاغا بوون. لەپاش کۆکین وسەر بادان وگرژ بوون ووتی:

ـ نەیســە کچی هەمــزە ئاغــا هەر چیش بکــا ڕێی تێ دەچێ! بەڵام کچی مچەتۆ بۆ لە قالبی خۆت دەرچووی؟ نازانی کچی کێی؟

هەندێکی تریشس کۆکی وبە دەم هەنسکەوە لەسەر قسەکانی ڕۆیشت:

ـ بەڵــێ !بــەڵــێ! نەوەی عەزیــزی مامــی باوکیشم ، خــوا سەلامــەتیــان کا، وە نەبــێ زۆر بە ڕێ وجــێ بن . . نابینی

ئەوەندە بزێوون ئەوەیان پڕ بە هەموو دنیا بلاو بوونەتەوە، گەیشتوونەتە مەکەومەدینەو قاپی ی **شام**. بوون بە ئەفەندی و دوای هەقی هەژارانیش دەکەن. نابینی کچی هەمزە ئاغا وەکو تەنیا لەگەڵ کچی مچە دەستە خوشکایەتی دەکا و ڕێ ی کانی خۆی با دەدا! بەڵکو جەرەش لەسەر شانی دادەنێ وەکو مسکینان دەچێتە ئاوێ!

کەس وەرامی نەدایەوە، ووزنە لەدەمی دانیشتووان دەرنەچوو، ئەلە چەوتەش لەخزمەت وەستا بووو چاوەڕووانی فەرمانی دەکرد. حاجی ئاغا داماببوو وەکو بلێی هێشتا بڕیاری نەدابوو چی بکا. دەستی بە کۆکین کردەوە، زۆری کۆکەکان سرووشتی نەبوون. بیری دەکردەوە، سەری با دەدا. لەپڕ خۆی ڕاست کردەوەو ڕووی کردە ئەلەو ووتی:

- خەبەر بۆ کچەکەی هەمزە ئاغا بنێرە بابێ بۆماڵی خۆمان بۆ ئەوەی تەنبێ ی بکەم، دەستە خوشکایەتی هەموو هەرچی و هەرچی پێك نەکاو جەرە لە سەر شانی دانەنێ وبچێ بۆکانی. . ئای کە شوورەیی یە! بۆمچەی ناشەریفیش سەرانەی خەتای کچی لێ وەربگرن.

- قوربان بەناوی چی یەوە سەرانەی لێ وەربگرین،

- بەناوی ئەوەی کچی خرو پڕوجووان و سمت گەورە و ئەستووورە نابێ بەم شێوەیە خۆی بنوێنێ لە ڕێ ی کانی ی ژنانا! ئەلە زمانی تێك ئالا، لە حاجی ئاغا نەگەیشت، چونکە ناوی ئەم سەرانەیەی بۆروون نەکردەوە. زۆر باشیش دەیزانی کەئەو سەرانەیە لەمەودووا دەبێتە سەرانەیێکی ترو دەچێتە ناو ئەوانی دیکەوە، ئیتر ووتی:

- قوربان! واتە سەرانەی سمت.

- بەلێ! بەلێ! گەوجە! بلێ «سمتانە»



لەڕۆژی ١١ی مارتی ١٩٨٤ لە
شاری عەننابەی جەزائیری نووسراوەتەوە.

چیرۆك

# دیاری جەژن



د. امین موتابچی

ئەوەندە دڵی پر بوو بوو خەریك بوو دەست بكا بەگریان
لالوگیان خێرە بۆچی واخۆت بێ تاقەت كردووەو بە خۆرایی خەم دەخۆی؟

گوتی: بروام پێبكە ئەوەی من ئەم ئێوارەیە دیم بروا ناكەم كەس دی بێتی و هەتا ئەو رۆژەی تورەكەی سەرم دەكەنەوە لە بیرم ناچێتەوە وەكو نووسینی سەركێلی شەهیدەكانی گردی سەیوان لەناو دڵما نەخشی بەستووە. ئێوارە هەر وەكو هەموو جارێ لەماڵ هاتمە دەرێ بە نیازی ئەوەی بچمە بەر دوكانەكانی گەرەكە كەمان نەختێ مێوە بكرم و چەند دۆستێكیشم كەوەكو خۆم سەریان ماش و برنجە ببینم. كە لەماڵ هاتمە دەرێو چەند هەنگاوێك رۆیشتم گوێم لە ورتە ورتێ بوو ئاورم دایەوە دوومناڵ خوشك وبرا بوون بەجل و بەرگێكی شرو پرو لەچك كراو پێلاو دراو بەناو قورەكەدا دەرۆیشتن و رومەتیان وەكوگولاڵەی ئاڵی بەهاری كۆسارانی كوردستان لەسەرمادا سوور هەڵگەرابوو من دەرۆییشتم و ئەوانیش بەدواما دیاربوو دەیان ویست بێن بۆ بەردوكانەكان. ئیترمن نازانم كە گەیشتمەبەر دوكانە كان لەپاش تۆزێ لە دوكانی یەكێ لەنا سیاوەكانم دانیشتم و سەیری پانتاییەكەی بەر دەمی دەكانەكانم دەكردو منالەكانم لە بیرچوەوە

لەپر نازانم چۆن سەرم هەڵبری تەماشام كرد لەناو ئەو سنوقە گەورەیەی كە چەند دەرگایەكی بۆسەرەو كرا بوونەوەو شارەوانی لە پانتاییەكەدا لەبۆ ئەوەی خەڵك خۆڵ و پیسی ناو ماڵی تێ بكەن، دای نابوو هەرحەفتەی جارێك خاڵیان دەكردەوە دووسەر لەناو ئەوشتەدا بەرز بوونەوەو تەماشایە كیان كردو نقوم بوونەوە. بروا بكە وام زانی پشیلەت چونكە ئەوسنوقە هەمیشە باشترین شوێنەبۆ پشیلەی نەگبەتیش كە بگەرێ بەدوای مل و موشا. زۆر جار پشیلەم تیادا دیوە كەچەپۆلەی بەرز دەكر دەوەو سەیری دەرەوەی دەكرد كاتێ كە گوێی لە دەنگی باخشبە یەك ببوایە.



نەخێر لەپاش تۆزێکی دی هەمان دووسەر بەرز بوونەوەو نەمان . کە چاوم تۆزێ قیچ کردەوەو سەیرم کرد، خۆڵەوە دوو منالەکەن کەلە دوامەوە دەهاتن تومەز ترسەتیان هێناوەو چوونە ناو سنووقە خۆڵەکەوە بەدوای شتی بەنرخ دا دەگەڕێن دەبێ تەنەکەی خۆڵ جگە لەپیسی ومیکرۆب بەقسەی دوکتۆرو زانایان هیچی تری تیادا بێ لەوکاتەدا ئاوڕم دایەوە هەر تۆزێ لەولای ئەوسنوقەوە یەك دوو ئوتومبێلی تازە مۆدێل وەستان و چەند منداڵێکی پۆشتە پەردا خی خوایی داو دابەزین و هەر یەکەیان چەند شتێکی یاری بەدەستەوەبە ئالەبیرم چوو بڵێم چونکە یەك دوو ڕۆژی مابوو بۆ جەژنی سەری ساڵ دابە زین لەگەڵ باوك و دایکی ڕێك وپێك داو خۆیان کرد بە موغازەیەکدا وگە لێ شتی شیرین و خۆش کە هەموو منالێك حەزی لێ دەکاوە کو نەستەلەو بسکویت ـ یان کری و سوار بوون و بەگەشەو پێکەنینەوە بەرەومالی گەرم نەرم. سەرێکم هەڵبڕی بۆ ئاسمان و گوتم خوایەگیان خۆتۆ بەحساب خوای هەموو لایەکی ئەمەت لەچی و ئەوەت لەچی باباتایە ناحەقی نەبوو دوو منالەکە هێشتا هەر خەریك بوون . دیار بوو کەجار جار سەریان بەرز دەکردەوە لەترسی ئەوە بوو مەبادا خۆڵ وشتیان بکرێ بە سەردا . چونکە زۆر جار دەم بینی خەڵك بە ئوتومبیلە کەیانەوە دەهاتن وتورەکە ڕەشە پڕ لەپیس و خولیان دەها ویشتەناو سنوقەکەوە .

سەرت نەیەشینم لە پەستیدالەبیرم چووەوە کە لەبەر چی بوو وا زوو هەڵسام و بەرەو ماڵەوە گەڕامەوە . تەماشام کرد ئای خۆ لەوە دوو منالەکەن! لە پێشمەوەن کچەکەیان یەك گونی لەو گونێ سپی یانەی کە برنجی لەمەریکی تیادا دێت پڕکردوە لەشت و براکەشی کەلەو بچوکتر بوو کارتونێك ناوی کورسی یەکی شکاوی منالانەی بەدەستەوە یەوە ستا بوون دیار بوو ماندوێتی خۆیان دەردەکرد . کچەکە خەریك بوو گونیکەی دەخستەسەرشانی تایرۆن . لە بەرخۆمە وە گوتم ڕۆڵە دیارە لەمەش دیاری جەژنی ئێوەیە .

چیرۆك

# ترسی ناوێت

سۆران مەحوی



[١]

ماڵیحاجی گوێنی [١] ئەوەندەت دەزانی ، چەقە دوکەڵیان لە گەرەك بەر دەدا . . دوکەڵەکە بەسەر ماڵی ئێوەدا کەپرۆکەی دەبەست. لەناو خێزانەکەتانا تەنها تۆ عەررەتی کەباب و گۆشتی برژاو بوویت.

«ئاخ!!بۆ نان و کەبابێك ، یان یەك دووپل گۆشتی برژاو چەند خۆشن بەترشیاتی خۆماڵیەوە!!»

لەو خەیالەدا دەمردیت و دەژیایتەوە، کەچی دایکت لە زەوقی دایت و پێی لە باوکت خستە کەوشەوە . ئەبێ بەیانی لەگەڵ خۆیدا بتبات و دەردی پار نەهێڵێت تێکەڵاوی مندالانی هەرو

چووختی گەرەك ببیتەوە

ئەو گشت رۆژێ شەبەقی عەرەبانەکەی لە بازارە پچکۆلەدا[٢] رادەگــرت. بە خێرو قازانـجی ئەو عەرەبـــانــەیە بە خێوی دەکردن. . هەر چەندە کولەمەرگی دەژیان، بەڵام خێزانێکی بەختیار بوون.

بەیانی زوو لەگەڵیا کەوتیتە پاڵدانی عەرەبانەکە، و بەرەو بازارە پچکـۆلـەکشان . . لەچەقی گوزەرەکەدا چەقین. . گوزەرەکە لات هێنـدە سەیر بوو. . چاوت بەهەمۆولایەك دا دەگێڕا. .

یەکە یەکە شارەزای دوکانەکان بوویت ئەو لەبەر خۆیەوە: دەیووت

ـ ئەمەت باشتر نی‌یە؟! بۆخۆت چاوو رووت دەکرێتەوەو سەرە تەقێیەکیش دەکەی!!

بەوەی نرکـەت لێوەنـەهـات . . قسـەکـانت بەدڵ بوون . . رادارەکەی هەست و نەستیشت وایی دەخوێندەوە «قازانج لە ئیش کردنـدایە!! نان خواردنی رەنج بەلەزەتە!! خوایە نانی منەت باری کەس نەیخوات!!»

ئەو رۆژە تەقەلایەکی زۆرت دا. . لەخۆشیانا باڵای دەکرد. . «ئەو. . بەدەنگێکی بەرز»

ـ چاو ەروانی ئەوەم نەدەکــرد ، بـەم جۆرە بێت!! ئەگـەروا بمێنێتەوە سەرکەوتن مسوگەر دەکات. . منیش لەوە زیاتر چیم دەوێ.

ئەو رۆژە فرۆختێکی چاکتان بوو. . تۆ زیاتر لە ئەو بە وەزعەکە دڵشاد بوویت . . دواشت هەر یەکە لە ئاشێکتان دەکرد «ئەو. . »

بەڵێ ئەو. . لە روانگایەکی دژ لە تۆوە بە دنیادا دەیروانی . . دەیویست ئەوەی چنگی دەکەوێت. . کۆشك وتەلارێکی لێ

بنیات بنێ و لە کۆڵ ئەو عەرەبـانـەو ئیشی دەست گێڕی‌یە بێبیتەوە «تۆ. . »

ئا توش. . ئەوانەت گەرەك نەبوون . . تەنها ئامانج و ویستت ژیانێکی بەختیار و گوزەرانییەکی پڕ ئاسـوودەی بوو. . سەر

ئەنجام ئەو بیرانە لەخەیاڵتان دا کاری خۆیان کرد. . تۆچۆن بۆ چارەیە دەگـەرایت سفت و سوێی ئازارەکـان بشەکێنیت

ئەویش هەر وەها هەمانی ریگای خۆی گرتبووە بەر

ئێواری ماڵەوە چوویت . . لە جیاتی ئەوەی ژانەکانت سارێژ بیتەوە. . سەر لە نوێ وەك جاران ئاهـ و خەمەکان یەخەیان گرتیتـەوە!! چەقە دوکەڵەکەی ماڵی حاجی یوسوو بوچەرۆکی رۆژە رێ دەچوو. . بەو دیمەنە رادارەکەی هەست ونەستت

کەوتەوە هەڵچوون و داچوون . . خۆزگە ماڵی حاجی ئەجری دراوسێتی‌یان دەفامان و هەندی کەبابیان بەم دیەوەدا دەکرد!!»

ئەو ئێوارەیە تا دەرنگانێك چاوەروان بوویت. . کاتێکت زانی هیچ نی‌یە. . ناچار ملت بە سەر شەرباکەیا شۆڕکردەوە . . بەو شەوە خەوت لێ‌تـەقی. . جەنـــدان پرسیاری بێ وەڵام یەخەی دەگرتیت.

شەبـــەقی زوو هەستـــایت . . لە دوێنی زیاتـر بە تەدووقـەوە عەرەبـــانـــەکـــەت پاڵ دەدا. . عەرەبـــانـــەکـە لە جەرگـەی قەڵـەبـاڵقی‌یەکـەدا وەستـانـد. . ئەمرۆ جیاواز لە رۆژان.

بەرامبەر دوکانی کەبابخانەکە شوێنی خۆتان گرت . . ئەملا ئەو لاتان چەند دوکانێکی سەوزە و میوەجات فرۆشتن بوون

ئەو رۆژە بە تەواوی مەزاجت کۆرا بوو. . بیرت تەنـــانـــەت جەستە شەکەتەکەت کەوتبوونە میانەی دوو بەرداشی کەوزەی هارینەری پڕ لەسەیرو سەمەرەوە:ـ

«یەکەم. . . . »

زۆر سەیر بوو، خەیاڵێك بە مێشکتـــا کوزەری دەکـــرد کە بەرامبەری رەق و وشك بوویت وهیچ سۆزو نەرمییەکت لە روویانـا نەئەنواند. . . تەنانەت بە دەوری خۆشتا جوغزێکی پۆلایت کێشـابـوو، بەزەحمـەت لێی دەربـاز دەبوویت.

دنیاشت وەها دەبینی ، کە لە دنیادا بژیت و ئیتر هیچ گۆران و جوانکاری‌یەکی ئەوتۆی تیانی‌یە تا بۆی بمری

«دووەم. . . »

زۆر جاری تریش لە خۆتـــەوە تەلـیـــســـمـــی ئەفــســـانـــە سیحـــراوی‌یەکـــەی ژیان، بۆ حاڵ و گوزەرانێکی هێدی و خۆشی دەشنـاو بێ هیچ هێزو قورسایی‌یەك دەکەوتە بەستەو ئاواز چنـــیـنـــی ئاســـوودەیی و سەرەفـــرازی ژیان و داوێنی

بەختەوەری‌و خۆشی دەکرد نەك ـ ژیانێکی کاتی، بگرە بۆ ژیانێکی هەمیشەیی و نەبراوە

بە هەر حاڵ لە بریکـا خەیاڵت لە هەمـوو ئەو شتانە لای‌دا وچووە سەر رازێکی‌تر و هەر لەخۆتەوە رادارەکەی هەست و نەستت وایی دەخـوێندەوە: ـ «ـ مرۆڤ هەر مرۆڤە!! ئەی تۆ بۆچی وێنـەی ئەوان ئاهـ و حەسرەت و خۆزگەو ئاواتەکانت سەر ناگرن و کوڵ بەو سرو نهێنیی‌یانەی‌ژیانت نادەن کە هەیە؟!».

پاش تۆزێ بیرکردنەوە: ـ

ـ ئاخر خۆشم نازانم چۆن چۆنی لەم کارە حاڵی ببم؟! بۆ ماڵی حاجی وا و ئێمەش بەم جۆرە؟! خۆ کفر نابێ ئێمەو مانایش بۆ رۆژێ چەقـە دوکـەڵێ لە گەرەك بەربدەین؟!! نەخێر ئەو رۆژەش ئیشتان باڵابوو. لەگەڵ هەر جووڵەیەك دا کۆمەڵێ خێرۆڤـەر بە سەرتـان دا دەرژا. . دووبـارە لە پرێکـاخـەیاڵ پلاوەکـەت بۆ هاتەوە. . . سەر لەنوێ رادارەکەی هەست و نەستت وایی دەخوێندەوە «ـ ئەڵێم!ـ بیڵێم و ناوێرم!! ئاخر بۆ ناوێری؟!! گوناحت. . . تاوانت!! داوایەکە دەیکەیت. . . ئەنجـام دەڵێت: ـ ئا یان نەء!! پاش ئەوە چەشنی شێتێکی بێ‌وەی. . راپەریت و بێ‌لێکدانەوە یەکسەر دوو هێڵی چەپ وراست بە سەر گشت شتەکانت دا هێناو پەشیهان بوویتەوە. ئەوەنـدی پێ نەچوو. چوویتەوە سەر بەزمەکەی جارانت

هەر دەیڵێیم: ـ ئەوە نی‌یە تەریقم بکـاتـەوە!! و پێم بڵێن بە راستـی هەتیوێکی نەوسن و چڵێسە!! زیاتـر لێی چوویتـە پێشەوە. . . ئاکام بێ پەروا رووت لێ ناو وتت: ـ

ـ بابە. . . لەگەڵ تۆمە بابە. .

ـ ها . . .

ـ بەشکم ئەمرۆ!!

ـئەمرۆ چی؟!

ـلە بازار. . .

ـ چی ؟!

ـ قاوڵتی بکەین!!

هەر ئەوەندەی گفتی‌دا . . . پەرۆ شرەکەت لە عەرەبانەکەوە ئالانـد. . هێنـدە بۆ کەبـابخـانەکە بە پەلە چوون. . ئەگەر شۆفـێری تەکسی‌یەکـە بە ئاگـا نەبـوایە ئەنجن ئەنجنی دەکردن. . . کاتێ چوویە کەبابخانەکە. . . حەمەلەی کەبابچی پێی ووتن: ـ

ـ نە ئەبوو زووتر بهاتنایە؟!! ئەبێ ببوورن قیمەمان هەر بەشی دانیشتوان ماوە

بەدەم کەباب برژاندنەوە: ـ

ـ هەڵیگرن بۆ بەیانی . . . گۆشتی مەریشهان دەبێ!! پاشەو پاش گەرانەوە. . لە داخانا پەلە بێتکەت لێ بدرایە دەتـەقیت خەم و خەسرەتێکی زۆرت هەڵکێشا «ـ ئەمەش لە بەد بەختی من بوو».

•

کاتێ ماڵـەوە چوون. . وێنـەی مارێکی لێدراو سەرتـاپـای جەستەت دەینالاند. . بریارت دا پاش نیوەرۆ لە ماڵ نەچیتە دەرەوە. . «ـ ئێ باشە بە چی‌یەوە خۆت خەریك دەکەی؟!» هەندێك لە پەراوەکانی قوتابخانەت هێنا. . بەیادی خوێندنی ساڵانـی سەرەتـایی‌یەوە تۆزێ لە پەراوی ژیانـداری پۆلی چوارەمی قوتـابخـانە ورد بوویتەوە. . یەکە یەکە پەرە رەنگاو رەنگەکانت هەڵدایەوە. . دەرەنجام دیدەکانت بەسەر وێنەی دوکـانی چێشخـانـەکـەوە نیشتەوە. . تۆ لە گشت شتەکانی چێشخانەکە. . دڵت هەر بەلای خواردنە برژاوەکانەوە بوو. . لە ژێر وێنـەی چێشخـانـەکـەدا . . بەختێکی درشت ئەمـە نووسرابوو. . پێویستە شوێنە گشتی‌یەکان خاوێن رابگیرێن. . دوای ئەوە ئەمـە نووسرابوو. . ئەوەندە بخۆ ئێنتەلا نەکەی!! سك چوون پەتایەکی بەڵڵایە

«ـ حەی. . حەی. . بۆ من زام لەو شتـانـە شکـاوە؟! تا ئێنتـەلای پێ بکـەم؟! هەژارێکی وەکـو من بۆچ جارێ تاسـووقم لەو شتـانـە شکـاوە؟ تا دووچـاری سك چوون بوویم!!» پاشان بە دەنگێکی بەرز: ـ

ـ دەترسێم بەیانیش دەردی ئەمرۆمان تووشی ببێتەوە؟!! دوای کەمێ بیرکردنەوە: ـ

ـ لە هەموو هەورێ باران ناباری. . مەرج نی‌یە سبەیش هەر هەمان رووداو روو بداتەوە. . . ئەگەر رووشی دایەوە ئەوە چش.

دوای ئەو بیرۆچکانە چاوی وەنەوزدانت، خستی‌تە باوێشك پێدانێکی زۆر، پاشان خۆشت نەتزانی چۆن چۆنی خەوت پێ کەوت.

چیرۆك

# وس س س س ....

**نووسینی ئانتۆن چێکۆف**
**وەرگێرانی لە ئیتالی‌یەوە**
**- یاسینی فەقێ سەعی -**
**١٩٨٩- سلێمانی**

ئیڤـان یگـورۆڤیـچ کراسنـوخین ڕۆژنـامەنـووسێکی پلە مام ناوەنـدی‌یـە، شەو درەنگـانێ بەرەو مالـەوە دەگـەڕێتـەوە، زۆر مات و خەمبـاره، دەڵـێی بیـر لە کارەسـاتێکی سەخت دەکاتەوە، هەر کەسێك ببینێ وا دەزانێ چاوەڕوانی پشکنینێك دەکـات ، یان خەریکـە پرۆژەی خۆکـوشتن دادەڕێـژێ چەند جارێـك ئەمسـەرو ئەوسـەری ژوورەکـەی کرد، وەستاو کەوتە ئالۆسکاندنی قژی، بەدەنگێکی پڕ لە ڕق و بێزاری‌یەوە، وەك بیـەوێ پەیمـانێکی هەتـاهـەتـایی بدات وتۆڵـەی خۆی لە خوشکـەکەی بکاتەوە کەوتە گفتوگۆ«ئەوەتام لەم ژوورەدا، وەك کابـرایـەکی دۆڕاو گیـانم بێ‌هێـزو شەکـەتەو دڵیشم گوشراوی چەوسانەوەو ئازارە، دەبێ بچمە سەر ئەومێزو کورسی‌یەو کەمێ بنـووسم ،ئـاشێ بەمـەش بووترێ ژیان؟! زۆر سەیرە تائێستا کەس نەهـاتـووە باسی ئەو دو لایـەنی‌یـە پڕ ئێش و ئازارەی دەروونی نووسـەر بکـەن کە بەردەوام تیـایـدا دەژی‌و ئازاری دەدات کاتێ خـەمبـارو ماتـە دەبێ خەڵکی بهێنێتـە پێکـەنین ،کـاتێکی دیکـە خۆشحـاڵ و شادە بەڵام دەبێ لەسـەر داوای خەڵـك شیـوەنێـك بگێـڕی‌و لە فرمێسکـەکانیدا بتوێتەوە. من هەست دەکـەم زۆر لە خۆم دەکـەم هەمـوو جارێ کە پێـویستە وەك کابـرایـەکی یاریبـازو غەریزەیی و سوعبەتچی خۆم پیشان بدەم ،منێ کە هەمیشە چەوساوەی دەستی خەم و ئەندێشەم، ئیتر یاخۆم ناساغم ،یان منالێکم لە سەرەمەرگایە، یان ژنەکەم خەریکە منالێکی لەباردەچێت»

ئەمـانـەی ووت و هەردوو دەستی لە تورە بوونـا کردبـوونـە مستەکۆڵە وچاوەکانیشی بە دەوروبەریدا دەگێرا، پاش کەمێك بەرەو ژووری نوستنەکە کەوتەڕێ ژنەکەی نووستبوو، بەئەگای هێنا: «نادیە وا من دەست بە نووسین دەکەم، بۆخاتری خوا، نابێ کەس بوژۆم بکـات ،نـووسین لەگـەڵ ژاوەژاوی منـاڵ وپـرخـەپـرخی چێشتـەکـەرەکـان دا مەحـاڵـە بکرێ چایەکی جوانـیـشـم بۆدەم بکـەو بریـای کەمێ گۆشـتیـشـت بۆ سووردەکـردمـەوە. . خۆت دەزانی من بەبێ (چـا)هیچم بۆ نانـووسـرێ ئا. . ئـا. . چـا. . نادیـە. . چـاتـەنیـا شتێکە کە دەتـوانـێ لەکـاتـێ نووسـیـن دا هێـزو ووزەم وەبـەر خاتـەوە». ئـەمـانـەی ووت و بەرەو ژوورەکـەی گەڕایـەوە دەستی کـرد بەگـۆڕینی جلەکـانی پالتـوو هێلەك وپێـڵاوەکانی داکـەنـدو زۆر بەسستی‌یـەوە خۆی گۆری لەسـەرو سیمـایـدا نیشـانـەی بێ‌تـاوانێکی داخ لەدڵی چەسپـانـدو دەم وچـاوی بەیـەکـداداو لەسەر کورسی و مێزی نووسینەکە دانیشت. هیچ شتێ بەرێکـەوت نەهێنراوەتە سەر ئەم مێزەو گەلێ دووریشە لە کارتێکردنی ژیانی ڕۆژانەوە، سەرتاپای شتەکان ئەوە دەردەبڕن کەئەم شوێنە ماڵی بیرکردنەوەو توێژینەوەی زانستیانەی وقوڵ و پرۆگـرامی چەسپـاوو قەڵـەوە. کۆمـەڵێ پەیکـەری گچکـەو کەللەسـەرو وێنـەی نووسەرە هەرە ناودارەکان دانراون فایلێکی ئەستـوور بە دەستنـووس و ڕەشنـووس پڕکـراوەتەوە بەرگێك لە کتێبـەکـەی (بلینسکی)یش دانـراوەو چەنـدەهـا لاپـەڕەی لێ

نوشتێنراوەتەوە بەنیازی نیشانە کردنی باسێ یان بابەتێك ئێسکی پشتەوەی کەللەسەرێکیش وەك تەپڵەکی جگەرە دانراوە لاپەرەیەکی ڕۆژنامەش زۆر بەنارێك وپێکی نووشتێنراوەتەوە بەڵام هەرچۆنێ بێت بەشێوەیەك دانراوە کە ئەو بەشەی بە ڕەنگی پیرۆزەیی خراوەتە چوارچێوەیەکەوە لەبەرچاوەو دەبینرێ. لەلای خوارەوەش بەخەتێکی درشت چەند تێبینییەك نووسراوە«ترحیو»زیاتر لە (١٠)پێنووسی تازەی نوك تیژ ئامادەیەو ژمارەیەکی زۆریش پەڕەمریشك و ئوچ و شووشە مەرەکەب ڕیزکراون ئەمانە هەمووی لەبەئەوە بەو زۆرییە دانراون کە هیچ کارەساتێ یان ڕووداوێ، وەك کتوپڕ شکاندنی نوکی پێنووسێ، نەتوانن بۆیەك چرکەش چییە کاربکەنە سەر وەستاندن و دواخستنی ئیلهامی داهێنان و نووسین . . کراسنوخین بەسەر پشتی کورسییەکەداپاڵی داوەتەوە، چاوەکانی داخستوون و خۆی لە قولایی بیرکردنەوەی بابەتێکدا توندکردووە. گوێی لە دەنگی نەعلەکانی ژنەکەی دەبێت، بە شاپلیتەیەکەوە (نادیە)خۆی دەکات بەژوورا بۆگردانی هەتا بتوانێ سەماوەرەکە دابگیرسێنێ دەگەڕێتەوە چێشتخانەکە، هێشتا بەباشی خەبەری نەبۆتەوە، چەند جارێك سەرقاپی سەماوەرەکەو چەقۆکەی لەدەست دەکەوێتە خوارەوە. . پاش کەمێك دەنگی گیزەگیزی سەماوەرو قرچەقرچی گۆشت سوورکردنەوە دەگەنە ژوورەکەی ژنەکەی بەبەردەوام هەر تەپەتەپی دێت و بەدەوری زۆپاکەدا دەگەڕێت چەند جارێ چەکەجەکان دەکاتەوەو دەرگای دوکەڵکێشەکەش دەکاتەوەو پێوەی دەدات. کراسنوخین لەناکاودا یەکبەخۆی بەحەوادا دەچێ و هەردو چاوەکانی زەق دەکاتەوەو دەکەوێتەو بۆن کردنی هەوای ژوورەکە، «ئەی هاوار خوای گەورە ئەمە خۆئۆکسیدی کاربۆنە»دەم چاوی بێزاری نارەزایی دەدا بەیەکا، «ئۆکسیدی کاربۆن ئەم ژنەی من خواش ئیدارەی لەگەڵ ناکات، ئێستاش هەرلەسەر ئەو بیرو نیازەیەکە ژەهر خواردووم بکات. ئەوەتاباوکم ئێوە بۆفتتان نەبێ، بۆخواتان بێ هەیە لەشوێنی ئاوادا بتوانێ بنووسێ؟ ها. . هەیە؟ »بەڕاکردن بەرەو ژنەکەی چوو، کە گەیشتە چێشتخانەکە وەك تۆپ هاوار و قیژەی خۆی بەسەردا تەقاندەوە پاش چەند دەقیقەیەك ژنەکەی زۆر بەشێنەیی و بێدەنگییەوە لەسەر نووکی پێ پەرداخێك چای گەرمی بۆهێنایە ژوورەکەی . ئەو وەك لەوەوپێش لەسەر کورسییەکە پاڵی دابووەوە، چاوەکانی داخستبوون ، بەقوڵی کەوتبووە نێو دنیای بیرکردنەوەی بابەتەکەیەوە، نقەی لەخۆی بڕیبوو، بە دو پەنجە تەپڵی بە تەوێڵی لێ دەدا، واخۆی نیشان دەدا کەئاگای لەهاتنی ژنەکەی و (چا)گەرمەکە نییە لەسەر دەم وچاوی هێشتا نیشانەی بێتاوانە داخ لەدڵەکە مابووەوە لەناکاوەوەك ئیلهامێکی بۆ نازڵ بووبێ و مەبەستەکەی پێکابێ سەرتاپای گۆرا ، وەك کچە عازەبێك باوەشێنێکی گرانبەهای پێشکەش کرابێ کەوتە نازو مەکرکردن پێش ئەوەی ناونیشانی بابەتەکە بنووسێ چەند چرکەیەك بەو نازو مەکرەوە شانازی بەخۆوە دەکردو دەیوویست لەمە تێربێت بەهەردو دەست لاجانەکانی خۆی گرتبوو، لە بن مێزەکەدا قاچەکانی نووشتاند بوونەوەو وەك نەخۆشێك خۆی گرموڵە کردبوو. چاوەکانی لەیەك نان و وەك پشیلەی سەر قەنەفە خۆی مت کرد. . پاش کەمێك وەك ئاگای لەخۆی نەبێت جووڵەیەکی غەریزەیی کردو دەستی برد بۆپێنووس و شووشە مەرەکەبەکە، ئینجا کەوتە فیزکردن و سەربەرزکردنەوەو سنگ دەرپەڕاندن هێندە شانازی بەخۆوە دەکرد وەك بڵێی ئەو دەست و پێنووسە ئێستا ئیمزای لەسێدارە دانی چەند کەسێکی پێ دەکا کەوتە نووسینی ناونیشانەکە. .

ـ دایکە. . ئاو ئەخۆم»یەکێ لە منداڵەکانی هاواری لێ هەستا ژنەکەی بە پەلەپەل«وس س س س. . بابە خەریکی نووسینە. . وس»بابە وەك پاڵەوان دەنووسێ و ووچان و وەستانی بۆنییە، هێندە خێرایە هەندێ جار بواری هەڵدانەوەی لاپەرەکانیشی نامێنێ ، هەر هەموو پەیکەرو کەللەسەرو وێنەی کەڵە نووسەرەکان چاویان لە ئاستی بلیمەتی و خێرایی بابەدا زەق کردوتەوە. ئەوان توانای پچوکترین جوڵەیان نییە، بەڵام لەدڵی خۆیاندا دەڵێن «ئای کاکی برا

ئەو تواناو هێزە چییە هەتە، ئەمە چ ئیلهامێکە بۆت هاتووە؟!»

جیکەی پێنووسەکە بەسەر لاپەرەکەدا. دێت«وس. س. س. . س» «و س س س س» نووسەرەکانیش هەموو جارێ کە بۆهاودەنگی لەسەر مێزەکە لەگەڵیدا دەبن، بە هۆی جولاندنی ئەژنۆیەوە ئەمانیش دەکەونە جوڵەو سەما . . وس. . س. . س. . س . . لەناکاودا (کراسنوخین) پێنووسەکەی دادەنێت وگوێ قولاغ

[illegible] لەسەر یەك ئاواز دێتە بەرگوێی
[illegible] ڕاست دەبێتەوە بەرەو دیواری ژوورەكەی
دەچێ [illegible] گریجی یەكی تیادەژی دەبینی (فۆما
[illegible]
[illegible] (فۆما) [illegible]
[illegible] نكەن [illegible]
[illegible] هیچ بنووسم » ئێری كاكەگیان داوای
[illegible] (فۆما) دێتە [illegible]
[illegible] ڕەشكردنەوەی پێنج لاپەڕەی كەلە
[illegible] هەردوو دەستی بڵاوكردەوەو
[illegible] خوای گەورە، ئەوە خۆ كاتژمێر
[illegible] هەر سەم بەتەنیا تا
[illegible] وبێزاری دەربڕین
[illegible] لایەكدا لاردەكاتەوە تەواو بێ هێزو
[illegible] زۆر دەكات بەرەو
[illegible] نووسینەكەیان دەچێ و ژنەكەی بەئاگا دەهێنێتەوەو
[illegible] زۆر لاوازبێ ی دەڵێت: «نادیە. . كەمی (چا)ی
[illegible] هەست ئەكەم هەرچی هێزی تیاما نەماوە. . »
ئاگەڕێتەوە سەر مێزەكەو دەست دەكاتەوە بەنووسین هەتا كاتژمێری چواری شەو بەئەوپەڕی دڵخۆشی یەوە ئامادەیە تا كاتژمێری (شەش)یش دانیشێ و بنووسێ ئەگەر بابەتەكەی نەگەیشتبایەتە كۆتایی

ئەو نازو مەكرو لە خۆرازیبوونەی بەرامبەر بەخودی خۆی و ئەوشانازی و سنگ دەرپەڕاندنەی بەرامبەر بەوشتەبێ نیشانەودوور لەچاوی ناحەزو بەد لەگەڵ ئەو هەڵس وكەوتە دكتاتۆری و زاڵمانەیە لە ئیش كردنا لەسەر ئەو پارچە فۆرمیكایەی چارەنووس فڕێیداوەتە بەر تواناو دەسەڵاتی (مطلق)ی نووسەر، ئەمانە هەرهەمووپێكەوە بوون و بەرامەو شیرینی دەبەخش بە بوون وژیانی (كراسنوخین) ئیتر چۆن هەرگیز جیاوازی نابێت لە نێوانی ئەم وئەوپیاوە گچكە پاك و تەمیزەی كە ئێمە ڕاهاتووین بە بینینی یان لە دەستەی نووسەران یان وەك سەرنووسەری ڕۆژنامەكان.
«بەشێوەیەك خەوم زڕاوخۆشم نازانم ئایا دەتوانم بخەوم و خەوم لێ دەكەوێت» لەبەر خۆیەوە ئەم قسانەی كردو بێدەنگ خۆی كرد بەنێو جێگەی نووستنەكەیداو لێ ی ڕاكشا. «ئەم بیرە بەعلی بەتی یەی ئێمە، عەزیێتی زۆرە مەگەر هەر ئیشی كەسێ بەكی سزادراو بەكاری قورس وەك ئێمە بێت چەند دەسڕێكەو لەشمان هیلاك دەبێت گەلێ زیاتر مێشك و بیرمان ئەكەت دەبێت لەوانەیە ئێستا خواردنەوەی سوودەیەك زۆر باش بێت ئای خوای گەورە تۆ بەو سەرەوە ئاگات لێ یە وەڵڵاهی لەبەر ماڵ و منداڵ نەبوایە لەبیخەوە ڕەگی خۆم لەگەڵ ئەم ئیشەدا هەڵدەكێشا. . نووسین لەسەر داواو بەبێ ی ویست و پێوانە كارێكی تابلێ ی زەحمەت و دژوارە. . »
سبەینێ تا كاتژمێری دوانزەی نیوەڕو دەست لەملانی خەوێكی قوڵ و بێ گرێ وگۆڵە دەبێت، لەوانەیە تا كاتژمێری یەكی پاش نیوەڕۆش هەر بخەوێ ئای ئەم حەمە گەورەیە. باشە چۆن پشووبدات وبخەوێت چ خەوێك بینێ چۆن گوزەران بكات گەر بیەوێ ببێتە نووسەرێكی ئودار یان سەرنووسەری ڕۆژنامەیەك یان بەرێوەبەری دەزگایەكی چاپ و بلاوكردنەوە.
«شەو هەتا بەیانی هەر حەریكی نووسین بووە» زۆر بەسەرسامی و ترسەوە ژنەكەی چرپاندی بەگوێ ی منالەكەیان دا «وس. . س. . س. . » كەس غیرەتی نی یە نەدەم بكاتەوەو بە هەنگاوێ هەڵبینێ و نە جوڵەیەك بكات نووستنی (كراسنوخین) شتێكی زۆر پیرۆزەو هەركەسێ ڕێزی لێ نەنێت تاوانێكی گەورە دەكات و سزایەكی توندو تیژیش چاوەڕوانی یەتی.
وس. . س. . س. . س. . س بە پانتایی ماڵەكەدا وەك هەوا كەوتوتە باڵەفرە. . وس. . س. . س. . س. .

* *

تەواو

تێبینی وسەرچاوە:
*لەدەقە ڕووسی یەكەدا ئەم «وس» ە درێژكراوەی دوا ووشەی قسەكەی
- فۆما - یە
سەرچاوە: ئانتون چێكوف - Anton cechov
- كورتە چیرۆك Ra cconti بەرگی یەكەم لاپەرە (١٨٦- ١٨٩)
-Volume primo , pagg 186-89 لە بڵاوكراوەكانی دەزگای Einaudi ی ژمارە (٦٦)ی زنجیرەی gli struzzi ساڵی ١٩٧٤

# دوو برا

نووسینی: ئەنجل کارالیتشف
گۆرینی: مولود خلیفاني
کۆلیجی پەروەردە زانکۆی بەغدا

کۆرین و بیتکۆ، دوو کورەکەی ئیلینی پیر، لەسەر میراتی باوکیان ناکۆکییان لە نێواندا پەیدا بوو، هەریەکێکیان دەیویست بەشی زۆرتری بەرکەوێت..

ئێوارەیەك، ئەوەندە نەمابوو وەك گورگ دەم بنێنە لەشی یەکترەوە، پیرە بانۆی ریش دان وماش رووی تێ کردن و پێی وتن: شەرم لە خۆتان ناکەن.. جارێ گوڵ لەسەر گۆری باوکتان وشك نەبووە، ئێوە لەسەر میرات بووەتە جەنگتان. باوکتان پیاوێکی باش و دادپەروەر بوو و هەمیشە بەرگری لە خەڵکی دەکردو خەڵکیش زۆر رێزیان دەگرت. باوەرتان بێت، خەڵکی دێیەکە بەهۆی باوکتانەوەیە بەم جۆرە رێزتان لێ دەنێن و بەردەوام بەسەرتان دەکەنەوە.. با دڵتان لە یەکتری پاك بێتەوە.. ئێوە بران، بامالّی دونیا چیاتان نەکاتەوە.. دەست بخەنە دەستی یەکترەوە»،

دوو کورەکەی ئیلین سەریان بۆ بانۆی پیر دانەواندو.. گۆرین سواری ئەسپە رەشەکەی بوو و بەرەو پەرێزەوە تاوی دا.. لەوێدا بینی وا سەپانەکان، کەئارەق دلۆپ دلۆپ لە نێوچاوانیانەوە دێتە خوارەوەو جل وبەرگیشیان، لەسەر پشت دا، دەڵێن کەفیان گرتووە، بە دڵی خۆشەوە دەستیان بە گۆرانی کردووەو سەدای بەستەش ل دۆڵەکانی خوارووەدا دەنگ دەداتەوە.

گۆرین، هەناسەیەکی قووڵ وگەرمی خەفەتبارانەی هەڵکێشاو لەپرێکا دای لە جلەوی ئەسپەکەی و رووی کردە دارستانی سەندیان. لەوێدا، لە نزیك کانیاوێك دابەزی و کەمێك ئاوی ساردی خواردەوەو پشتی دایە کڵۆرە دارێك و لە دونیای بێ بنی ئەندێشەوە جێی نەدەبووەوە. ؟!

پاش کەمێك، مێروولەیەکی زۆر بچووکی بینی خەریکی پالدانی شتێکی خرپلەی سپی بوو، دەلەوەندەی خۆی دەبوو، هەرچی دەیکرد، بۆ پاڵ نەدەدرا.

ئەوەندەی پێ نەچوو مێروولەیەکی تری وەك خۆی بچووك لە لایەوە ئامادەبوو وەك بڵێی برای بێت، لەگەڵی دا دەستی بە پالدانی کردو، زۆر بە ئاسان پاڵیان دا.

گۆرین لە حیکمەتی ئەم دوو مێروولە بچووکە (برا)یە سەرسام بوو.. قووڵ بیری کردەوە، تاریکی و کەمبینی بەری چاویان بەردا!!!

بیتکۆی برای گۆرینیش، لە هەمان کات دا، کە بینی براکەی ئەسپە رەشەکەی تاودا، ئەمیش خۆی و دوو هەڵۆکەی، رووی لە کەندالەکەی بەردێیەکە کردو لە سەر کەندالەکە لەژێر نسەیەك دا دانیشت.. بە چاوە قەتیسماوییەکانیەوە ئاسمانی شینی بێ گەردو رەزی تەلان و چەم و دارستان و دەشتایی ئەوناوەی دەپێوا!! لەناکاودا، بازێکی گەورەی پینی زۆر نزم لەم ناوەدا دەخولایەوە.. وا دیاربوو بەشوێن نێچیر بۆ دوو فەرخە بچووکە برسییەکانیدا، کەچاوەروانییان دەکرد، دەگەرا.

ئەو ناوە کپ و بێ دەنگ بوو.. وەك بڵێی هەموو گیانلەبەران خۆیان لە ترسی (پادشا)ی زۆردار شاردبێتەوەوابووا!

بیتکۆ تەماشای ئەم زۆر دارەی کردو، پاش کەمێك، هەڵۆیێکی بۆ بەرداکە وەك برووسکە بۆی چوو. لەئاسماندا بوو بە شەریان و پەرە سپییە خوێناوییەکانیان بەری ئاسمانیان گرت!!

کاتێ بیتکۆ زانی هەڵۆکە بۆی ناکرێ بازەکە ببەزێنێ و خەریکە خۆی دەبەزێ، هەڵۆکەی تری بەرداو، پێکەوە گشت لەشی بازەکەیان خوێناوی کردو، پێش ئەوەی گیانی دەربچێت، وتەیەکی کرد، وەك ئەوەی بڵێ خۆزیا برایەکی باڵ بەهێزو دەنووك تیژم دەبوو، ئێستافریام دەکەوت و رزگار دەبووم»!!

ئینجا چۆن بەرد لەئاسماندا دەکەوێتە خوارەوە، ئاوا بەربووەوەو تەپەی لە دۆڵەکەدا دەنگی دایەوە!!

بیتکۆ لە دڵی خۆیدا وتی: «پیاو لەم دونیایەدا ئەگەر برایەکی نەبێت، دەبێ برایەك بۆخۆی بدۆزێتەوە».

ئەمەی وت و خێرا بەرەو ماڵەوە رایکرد.. بینی برا گەورەکەی لەبەر دەرگای ماڵەوەدا چاوەروانی دەکات.. بۆی چوو.. دوو دەستەکانی ماچ کردو پێی وت: «بمبوورە.. قەت داوای میرات ناکەم.. دەمم لێك ناکەمەوە.. تۆ برای گەورەمی و لە شوێن باوکمی.. بمبوورە!!

گۆرینیش، سەری برا بچووکەکەی ماچ کردو وتی: «دوای لەمرۆ بەکژ یەکتریدا ناچین و پێکەوە دەژین.. یارمەتی یەکتری دەدەین.. ئەوەی هەمانەو دەستمان دەکەوێت هی هەردووکمانە».

چیرۆك

# کوللەو مێروولە

نووسینی: سومەرسێت مۆم

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە

محمد مصطفی قەرەداغی

سەردەمی منداڵیم بەزۆرەملێ هەندێك لە چیرۆکە ئەفسانەیی یەکانی (لافۆنتاین)یان پێ لەبەردەکردم و زۆر بە ووردی پەندو ئامۆژگاریی‌یە ڕەوشتی‌یەکانیان بۆ یەکالا دەکردمەوە. یەکێك لەوانە چیرۆکی کوللەو مێروولە بوو کە بە شێوەیەکی وا داڕێژ رابوو لە مێشکی منداڵی بچە سپێنێت کەلەم جیهانە ناتەواوەدا ئەنجامی هەوڵ و کۆشش خەڵاتەوهی هەرزەیی و هەڵەشەیش سزایە. هەروەك ئەم چیرۆکە نایابە بۆمان دەگێڕێتەوە (ببورن کە ناچارم شتێك بگێڕمەوە هەموو کەس گەر زۆر بەتەواویش نەبێت دەیزانێت) مێروولە بە درێژایی هاوین ڕەنج دەدات و زەخیرەی زستان دەخات، کوللەش بۆ خۆی بەسەر چڵەگیایەکەوە نیشتوەتەوەو گۆرانی دەڵێت. زستان دێت و مێروولە بۆ خۆی بێ خەمە، بەڵام کوللە کە عەمارەکەی هیچی تیا نی‌یە بە ناچاری پەنا بۆ مێروولە دەبات و بە کروزانەوە داوای کەمێك خۆراکی لێ دەکات، ئەوسا مێروولە پرسیارە کلاسیکی‌یەکەی دەکات:

- ئەی هاوین ڕۆیشت و برایەوە تۆ چیت کرد؟
- خوا بێ قەزات کات، شەوو ڕۆژ گۆرانیم دەگوت.
- گۆرانیت دەگوت، ئەی بۆ ناچیت ئێستاش بۆ خۆت تێر سەما بکەیت؟

هەرگیز من پەندی ئەم چیرۆکەم نەدەسەلماند. وەنەبێت ئەمەش لە کەللە ڕەقیم بووبێت، بەڵکو تا ڕادەیەك هەر لە نەفامی منداڵی‌یەوە بوو. لەو مەسەلەیەدا من هێندە لایەنگیری کوللەکەم دەکرد کە تا ماوەیەکیش هەر کە مێروولەیەکم بدیتبایە پێ‌یەکم پیا دەنا.

ئێستاش ئەم ڕووداوە کورتەی دەی گێڕمەوە بەو مەبەستەیە کە ناقایلی خۆم (کە هەروەك بۆشم دەرکەوتوە بۆچوونیکی تەواو مرۆڤانەیە) بەرامبەر بە تێروانینی هۆشمەندانە دەربڕم.

چەند ڕۆژێك لەمەوبەر کە تووشی (جۆرج ڕامسەی) هاتم لە چێشتخانەیەکدا شێوی دەکرد یەکسەر ئەو چیرۆکەی منداڵیم وەبیر هاتەوە. هەرگیز ئەم دیبوو کەس بەو جۆرە داماوی بەڕواڵەتی‌یەوە ئاشکرا بێت.بە جۆرێکی ئەوتۆ چاوی بڕیبوە ئاسمان دەت گوت هەموو قورسایی جیهان بەسەر شانی‌یەوەیە. منیش زۆر دڵم پێی سووتا، بە بۆچوونی خۆم وام دانا کە دەبێت برا بەد ڕەفتارەکەی پۆتێکی نوێی شکاندبێت، بۆیە بەرەو ڕووی چووم و تەوقەم لەگەڵ کردو گوتم:

- چۆنیت؟
- وەك دەبینیت زۆر دڵم خۆش نی‌یە.
- ناشێت هەمدیسان مەسەلەکە (تۆم)بێت؟

هەناسەیەکی هەڵ کێشاو گوتی:

- بەڵێ خۆیەتی.
- باشە بۆچی بەرەڵای ناکەیت؟ چی ماوە لە دنیادا تۆ بۆی نەکەیت؟ دەبێت ئیتر بزانیت کە هەموو هەوڵێك لە گەڵیا بێ سوودە.

پێم وایە خێزان نی‌یە یەکێکی تیا نەبێتە گونی قوڕ. (تۆم)یش بیست ساڵ بوو بووبوە نەگبەتی و شانی کەس وکاری گرتبووەوە. خۆ گەر بشڵێیت لە سەرەتاوە ژیانێکی پیاوانەی دەست دایە، کاری دەکردو ژنی خواست و بوو بە خاوەنی دوو منداڵ.بنەماڵەی (ڕامسەی)یش هەموکەسانی خاوەن ڕێز بوون، ئیتر بە هەموو بۆچوونێك وا چاوەڕوان دەکرا کە (تۆم ڕامسەی)ژیانێکی سوودمەندو پیاوانە بەسەر ببات. بەڵام ڕۆژێك هەر لە خۆوەو بێ ئەوەی پێشتر هیچ بدرکێنێت ڕای گەیاند کە ئارەزووی کارکردنی نەماوەو لە ژن و ماڵیش بێزارەو.

دەیهەوێت ئیدی بە ئارەزووی دڵی خۆی رابویرێت . هەموو رێ لێ بەستنەوەو سەرزەنشتێك لە گەڵیا بێ سوود بوو. دەستی لە ماڵ و منداڵ و فرمانەکەی هەڵ گرت و بەو پارە کەمەی کە هەیبوو یەك دوو ساڵێك لە پایتەختەکانی هەندێك لە وڵاتانی ئەوروپـادا بە خۆشی رای بوارد. جاروبار کە دەنگ و باسی بەفتارە ناهەموارەکانی دەکەوتنەوە بەر گوێی کەس و کاری بەواوی ی دڵ شکست دەبوون. ئەوان غەمی ئێستایان نەبوو، جارێ بۆخۆی باش رای‌دەبوارد ، بەڵام ترسی ئەو کاتەیان بوو کە پوولی بە دەستەوە نامێنێت ئەوسا دەبێت چی روو بدات ! هێندەی نەبرد بیستیان کە دەستی داوەتە قەرزو قوڵە . خۆیشی تا بڵێی بێ چاوو روو بوو سەرەرای ئەوەش

هێندە بە شان و شەوکەت بوو هەرگیز کەس سڵی لەوە نەدەکردەوە قەرزی پێ بدات . من بەش بەحاڵی خۆم کەسم نەدیوە چەشنی ئەو دەست بەڕووەوە نانێت پێ ستەم بێت . بەلای ئەوەوە هاورێیەتی بەستن لە هەموو شتێك ئاسانتر بوو. ئیدی بەم هاورێ‌و بەو برادەر کەمێك پارەی پێکەوە دەناو هەر دەم دروشمی ئەوە بوو کە پارە ئەو پارەیە بە بۆ رابواردن و خۆشی خەرجی کەیت ، بەڵام ئەوەی بۆ دابین کردنی پێویستی‌یەکانی ژیان خەرجی دەکەیت شتێکی بێ تامە.
(جۆرج) بە پێچەوانەی ئەوەو پیاوێکی پیاوانەو بەڕێز بوو، هەرچەندە لەوانە نەبوو بەو جۆرە رایانەی براکەی فریو بخوات کەچی تۆم کارێکی وای کردبوەوە سەری کە نەی‌دەتوانی دڵی بشکێنێت و یارمەتی نەدات، بۆیە ئیتر پشتی بەم ئەستوور بوو. یەك دوو جار بە بەڵێنی ئەوەی کە دێتە سەر بارو ژیانێکی ئاسایی نوێ دەست پێ دەکاتەوە، دەست خەرۆی کردو پارەی باشی لێ کێشایەوەو ئۆتۆمبیل و چەند پارچە خشڵێکی جوانی پێ کری.

دوای ئەو هەموو بەزمانە (جۆرج)گومانی نەما کە ئەو هەرگیز دانانیشێت ، ئیتر یەکجاری دەستی لێ شت. ئینجا (تۆم)بە جۆرێکی تر کەوتە پارە لێ کێشانەوەی. بۆ نموونە دەی‌گوت: من هیچ پێم شەرم نی‌یە لە مەیخانەیەکدا کار بکەم یا ببمە شوفێر، خۆگەر جۆرج ئەمەی پێ نەنگی‌یە با دووسەد پاوەندێکم بداتێ ئەوا لەبەر ناوو ناوبانگی خێزانەکەمان وازدێنم (جۆرج)ناچاردەبوو پارەکەی دەدایێ. لای ناخۆش بوو پارێزەرێکی وەك ئەم براکەی لە مەیخانەیەکدا خەریکی مەی گێران بێت وەیا بە خۆو تاکسی‌یەکەوە لە بەردەم یانەیەکدا

جاوەڕوانی نەفەر بێت.

جارێکیان (جۆرج)تەواو شپرزە بوو چونکە (تۆم)لەوانەبوو لە بەندیخانە توند بکرێت . ئەم مەسەلەیەی زۆر بە قورسی گرتبوو، ئەنجامەکەشی پێ شەرمەزاری بوو.

راستە تۆم زۆر سەرەرۆو خۆپەرست و هێندێك پووچ بوو، تەواو شوولیشی لی هەڵ کێشابوو بەڵام هەرگیز لەوەوبەر کارێکی وای نەکردبوو کە لەڕووی یاساوە بەرپرسیار بێت. دیارە کە ئەم جارە مەسەلە گەیشتبێتە شکات کردن دەبێت شتێکی وای کردبێت شایانی سزابێت . چۆنیش دەبێت لێ گەڕێت تاکە برابەکت هەبێت لە زیندان توند کرێت ئەو زەلامەی ئەم جارەیان تۆم دەستی بڕیبوو (کرۆنشۆ) ناوێك بوو کە کابرایەکی لێ بووردە نەبووو تەواو سوور بوو لەسەر ئەوەی مەسەلەکە

بگەیەنێتە دادگاو دەشی گوت تۆم کە هێندە هیچ و پووچ بێت دەبێت سزای خۆی وەرگرێت ئەم گێچەڵەش جگە لە چەرمەسەری و ماندوو بوونەکەی پێنج سەد دانە پاوەند لەسەر(جۆرج) کەوت ، خۆگەر کارەکە هەر بەوەندە بوەستایە قەیدی نەدەکرد، بەڵام (جۆرج)کە بیستی وا (تۆم)و (کرۆنشۆ)هەر کە چەکی پارەکەیان وەرگرت یەکسەر پێکەوە بەرەو (مۆنت کارلۆ)تی‌یان تەقاند ئیتر لە هەموو ژیانیدا ئەوەندە تووڕە نەبوو بوو. ئەوانیش بۆخۆیان بە جووتە لەوێ مانگێکی خۆشیان بەسەر برد.
تا بەم شێوەیە بیست ساڵی رەبەق تۆم پیشەی قومارو رەیسزو رابواردن، سەماو خواردن و خواردنەوە بوو لە گرانبەهاترین چێشتخانەکاندا.هێندە رێك پۆش بوو هەردەم دەت گوت ئێستا لە پاکەت دەرهاتووە.

کەس نەی دەگوت تەمەنی لە سی و پێنج ساڵ پترە هەرچەندە خۆی لە چل و شەش ساڵ دابوو.

بەو هەموو پڕو پووچی یەشی یەوە ئەوەندە رۆح سووك بوو کە هەردەم ئارەزووت لە هاورێیەتی ی بوو رووخۆشی و خۆش مەشرەبی یەکەشی تەواو کاری لە پیاو دەکرد. من بەش بەحاڵی خۆم ئەوهەموو پارەیەی لێ ئەسەندەم کەچی هەرگیز رقم لێ ی نەدەبووەوە . جار نەبووە گەر پەنجا پاوەندم پێ بدایە وام هەست نەکردبێت کە قەرزی بەسەرمەوەیە. کەس نەبوو (تۆم

رامسەی)نەناسێت، ئەویش هەموو کەسی دەناسی . هەڵس و کەوتیت بە دڵ نەبوو ، کەچی بەدەست خۆت نەبوو خۆشت دەویست .

(جۆرج)ی داماو هەمووی ساڵێك لەو برا نەفرەتی یەی گەورەتر بوو، بەڵام دەت گوت پیرەمێردێکی شەست ساڵەیە تا بڵێی سەر راست و ئیش کەرو پیاو بوو. هەموو بەیانی یەك لە سەعات نۆو نیوەوە تا شەشی ئێوارە لە فەرمانگەکەی بوو. لە ماوەی چارەکە سەدەیەکی کارکردنیدا ساڵی لە دوو هەفتە زیاتر پشووی وەرنەدەگرت لە ماڵیشەوە بۆ ژنەکەی دڵسۆزترین مێردو بۆ چوار منداڵەکەشی باشترین باوك بوو. لەکە چی یە بە ژیانی یەوە نەبوو نیازی وابوو کە تەمەنی بووە پەنجاو پێنج خۆی خانەنشین بکات و لە خانوویەکی بچووکی لادێیەکدا خەریکی باخداری بێت و یاری گۆڵف بکات . بۆ ئەو مەبەستەش هەردەم سێیەکێکی دەست کەوتەکەی پاشە کەوت دەکرد . کە دەچووشە ساڵەوە دڵخۆش دەبوو چونکەتۆمیش هەروەها دەچووە ساڵەوە . ئینجا دەستی پێکدا دەداو دەی گوت :

- تا ئێستا تۆم کە گەنج وجوان بووە هەمووشتێکی بە ئاسانی بۆ هاتووە پێش ، بەڵام خۆئەویش هەر تاکە ساڵێك لەمن بچووکترەو پاش چوار ساڵی دی دەبێتە پەنجا ئەوسا ژیان هەروا بە ئاسانی بۆی نابێتە گاڵتەی منداڵ . من کە دەبمە پەنجا سی هەزار پاوەند پێکەوە دەنێم ، بەڵام تۆم دەکەوێتە سەر ساجی عەلی و بەزمەکە خۆش دەبێت.بزانین ئەوجا کار دەکات یان وەك دەستی کەر بۆی دەکەوێت ئای (جۆرج)ی داماو! من هەمیشە بەزەییم پیادا هاتووەتەوە، ئێستاش کەلە تەکی یەوە دانیشتووم نازانم ئاخۆ تۆم چ پۆتێکی بەدفەری تری شکاندوە!

بەو شپرزەیی یەی کە پێوەی دیار بوو پرسی :

- دەزانیت چی رووی داوە؟

چاوەرێ بووم ناخۆشترین هەواڵی لە دەم ببیستم لە دڵی خۆمدا ووتم بڵێی ئاخری یەکەی تۆم کەوتبێتە داوی پۆلیسەوە :

هەرچۆن بوو (جۆرج)کەوتەوە دوان و گوتی :

- خۆ لاریت لەوە نی یە کە من لە هەموو ژیانمدا ئیش کەرو سەرراست و بەرێز بووم؟ دوای ئەو هەموو رەنج دان و دەست گرتنەوەیەشم خوا خوامە دەست کەوتێکی بچووك پێکەوە بنێم و بیخەمە کارێکەوە لەو باری ژیانەشدا کە خوا پێی رەوا دیوم ئەرکی خۆم بەجێ هیناوە .

- راستە .

- خۆ لاریشت لەوە نی یە کە تۆم بەردەوام تەمەڵ و هیچ و پووچ و داوین پیس بووە . ئەوەندەش دەسیت بروبێ ئابروو بووە گەر بە حەقیانەت بووایە دەبوو ئەنجامی پەك کەوتووخانە بووایە .

- راستە .

جۆرج سوور هەڵ گەراو گوتی :

- چەند هەفتەیەك لەمەو بەر تۆم پیرەژنێکی خواست کە بە دایکی دەشیا وا ئێشتاش پیرەژن مردو نیو ملیۆن پاوەندو یەختێك ، هەروەها خانوویەك لە لەندەن ویەکێکی دیشی لە لادێ بۆ بەجێ هێشت. ئینجا جۆرج کێشای بە مێزەکەداو گوتی :

- باپێت بڵێم، ئەمە رەوا نی یە . نەفرەتی لێ بێت رەوا نی یە، رەوا نی یە .

کە تەماشای سەرو چاوە توورەکەی جۆرجم کرد خۆم پێنەگیرا، دامە پرمەی پێکەنینێکی وەها هێندەی نەمابوو لە کورسی یەکەم بەربمەوە . ئیتر لەو رۆژەوە جۆرج لێم زیزە بەڵام تۆم زۆر جار لە خانووە دڵگیرەکەی کەلە ناوچەی (مەیفێر)بۆ نان خواردن بانگم دەکات جارو باریش گەر شتێکی کەمم لێ قەرز بکات ئەوە هەر ناچارەولێی بووەتە خوو، ئەگینا هەرگیز ئەو قەرزە لە پاوەندێك پتر نی یە .

* *

**سەرچاوە**

W. somerset maugham

Collectd short stories, Volume One.

pan Books in association with william Heinemann.

pp. 109-112

# خەجو .. مەم

● حەسەن ئیبراهیم ●

میاو، میاوا پشیکی یە ل دور رەخ و روینت تەختی دئیت ودچیت، و جار یا خود پیپکی تەختی دهسیت و کوریا خو دکەتە گوپال و فرت و خو هاڤیتە سەر تەختی . . . . . . هەر دوو درویسن، و ییت بەر ئیکدا دریژ کرینە . . . . مەمو دەستی خوبی هاڤیتی یە پرچا خەجویی، وەسا یا شدانەدی خودی بیژی سیامەندە یی ل هنداڤا دەریا وانی، دەما کیڤی قوچەك لیدای و دلاتا چیایی سیپانی خەلات دا هاڤیتی، بەلی خوب کیراتەکی ڤە گرت، ل هیڤیا خەجویا رەبەن، داوەریسیت حەڤت گوندا ب سەر ئیك ڤەکەت وجوتی کەزییت خوە ژی . . . ، لی حەراما نەگەهشتنی ئینا خەجویی ژی خو دلاتی دا هاڤیتە سەر وی لەشی هلاویستی، هەر وەکی ب سیدارا مروڤ خەرا راڤەدهەژیت جار دکەنیت جار دگریت، داپیکڤە بینە خواری دنیڤا دەریا وانی دا ببنە سپیندار و شین ببن . . . . . !! خەجو، دەستی خویی ژ برینا خو ڤەکری، ویی هاڤیتیە برینا مەموی، ! بەلی هندی رونڤك ژ چاڤیت رەش و بەلەك هاتنە خواری، و بسەر رویی سیامەندی رەبەندا بارین، ژ خەورانە بی ونەگوت خەجو مال خرا بی تەچی یە، ؟ رەڤا کیڤیا کیڤە چوو. . . . ؟!! دابیژتی سیامەندی لاو، ئەز خوشکا حەفت برامە، و دوتماما دوازدە پسمامامە . . . . مەمی دگوت :ـ، ئەز مەمی ئالامە میری خورت و لاوامە،

چەوا توڤێ نیڤا شەڤێ هاتیە سەر جهێ من. . . !!، بەلێ دەنگێ وی بسەر نەکەت، هندی زیندانا وی یا کویر بی، دەنگێ دەهول و زرنا دەهواتا زینێ نەدگەهشتە گوهێ وێ و مادخەودا. . . . !! پشیلك ل سەر سینگێ خەجویێ سپی و نازك هات و چوو هەر کوریا خودجوتێ مەمکێت وێ ییّت رویس هسین و پەنجێت وێ دگوشتێ تەر و نازکدا چوونە خوار، وخوهاڤێتە سەر دلێ مەموو دووسێ جارا خوینا دلێ مەموی ئالیست، هاتە بیدا ل شەڤە* زڤستانێت پر بەفر و سەرما وزکێ برس ل بەر کوچکێت نەمەردا، بەلێ هندی خوینا مەموی یا تیژ و دژوار بی، بی میاو، میاوا وێ و خوّد تەختیدا هاڤێتە خوارێ و قەستا ژ دەرڤەکر. . . !

دەرگەهێ ل تاقە، مالەکا بێ سەروبەر، هێشتا دویکێل یا ژ پاتا دچیت، بەلێ یا دڤەمریت، . . . .

***

ـ کوشتن، دڤیان بسوژن، چ کافرن!؟

ـ ماچ کرینە؟، ماوا بتنێ هوکریە؟،

ـ خویندارن؟، نە، نە، یارەڤاندی. . . . !!

ـ سەر بەختێ من بومە کریتە ئەڤ مروڤە دناڤ مەدا هاتنە کوشتن، هاتبونە سەر بەختێ مە. . . .

ـ ما ئەم چ بکەن، ئەوییّت ئێکن، ما ئەم دشێن خوو بکەنە خویندارێت خەلکی. . . . ؟!

***

ـ ئەز بەنی. . . ، ئەزبەنی. . . ئەز. . . ،

ـ بێژە کورو تە چ یە؟!

ـ ئەزبەنی. . . ، نە دیارە. . !!

ـ نەدیارە. . . !؟ چەوا نەدیارە. . . !؟

ـ ئەزبەنی خوە تورەنەکە دبێژن. . .

چ ؟! چ دبێژن کورو!؟

ـ یا خودایە رەڤان. . !!

ـ دگەل وی خوەلی سەرێ هەژار. . ؟

ـ بەلێ ئەزبەنی. . . . مادێ کیڤە چن!؟ قورتال نابن!

ـ دائەز بوهەوە بێژم. . ، گەلی مێرخاسا ماباب وباپیرێت مەژ ی کەسێ هونەکرییە، دڤێت ئەم ناموسیا خوە بشوین بخوینا وا. . . ، ئەردو ئەسمانا لێك بدەن، من دڤێت نەبنە بویك وزاڤاو هێشتا رۆژ نەدەرکەتی هوین بزڤرن وخەنجەرێت هەوە تەر ببن ژ خوینا وا دا کەس چاڤ ل وا نەکەت، ڤێجا ئەڤە یا ژمە کێمە ئەم حەژ بیانیا بکەن، ما کە چەلەك ل ناڤ مەنینە. . . !؟

ـ خوّدا رەڤان، رەڤاند، قەنج کرن، گیانێ وان خۆش. . . ، خەجوومەم، هەکە ناڤێ وان خەجووسیامەند یا یان مەم و زین بادا مێژ وخوّزڤرینت. . . . !!

ـ ئێڤاری رەڤاند، نە، نە هێشتا نیڤروبو. . . . ، «فلان کەسێ هەی تە روّژە نیڤرو خوّدایە رەڤان»، کیڤە بر. . !؟، خودێ دزانیت، خوّدێ وا بهێلێت، بەلێ مادێ کیڤە چن؟! دەستێ نەمەردایێ درێژە. . . !!

***

دوو بوّن. . . ، دوویێت چ؟! چوار بوّن. . . ، کورو چ چوار چ چل، ئەڤ کوّلانە تژی کر بون و هندی وان ل رەخ ورویێت گوندی بوّن. من گوت کا کینەو چ دڤێن؟ وەکی گورگا قەستا ژ وّرا وان کرن خوّدێ بێژ ی هەزارا یا نیشا دای.

ـ کەنگی ل تە بونە مێهڤان مام حەحی. . . ؟

ـ شڤێدی. . . من دزانی ئەگەرا وان. . . . مالا من ژ ی میرات کرن. . !!

ـ ما پشتی چ!؟ بوّچی، تە ئەم پێ نەحەساندن

ـ ماهوین دا چ کەن؟!

ـ داڤەشێرن. . .

ـ وللا چ فەسادو بە کروك نینن دا ئەم ڤەشێرن، ئەم نەشێن ل خو بکەنە نەیار زور دارا. ئەم دێ ئێکوددوو فکرین دا بچین ڤەشێرین. . . مامانێ هەرمە چ مێرانی پێ چێ نابیت. . . !! دێ گەهنە ئێك بهیڤیا خودێ و ئەڤیندارا. سوز بیت نەهێلم خوینا بە کروکی بییتە دریٚ و ل نیڤا وان ببتە دەرگەهـ. . . و ئەم گول و نێرگزا ل سەر زیارەتێ وان بچینین. . . . !!

چیرۆك

# پەزڤان

ناجی طه بەرواری



سەرێ بهارێ‌یە، ئاخلیڤەیە، بەفرێ گوندێ بەردای، چیاییت ناڤناڤە بوین بەلەکێت کەفتینێ، خەلك هەمی یێ کارێ خو دکەن دێ چنە کەزاخ و کولان و پیچانا رەزێت خو، ئەرێ ما بوچی ئەز ژی ناچم دهەوارا رەزێ خو؟

بکەزیخم و بکولم نێ بخەم سارێی و دەست بەردانێ ناقەتیت، سوبەهی هاڤینە چاڤێت بچویکێت من دێ مینە لخەلکی بو ئویشی‌یەکێ تری، نەئە.... بو من هوسا بریڤە ناچیت، ئەز ژی میرم وەکی هەمیا، ما ئەو چوژمن زیدەنە، کو ئەز بچم هیفیا ژ وان بکەم بو ئلیەکا تری، نە بلا ئەو بهێن هیفیا ژ من بکەن هەتا هندەك فێقی، ئویشی‌یەکێ تری، یان کتەکا میوێژێ بدەمێ. هوسا رەزڤان دگوما هزر و بیرا دا نوقم ببوو. دەمەکێ بسەر فوڤە هات لخوزڤری، ل ژنکا خو کرە گازی و گوت:

- گولێ ها .... گولێ.

- بەلێ بابێ دلوڤانی، کەرەمکە تە خێرە؟

گولێ بڤی رەنگێ جوان بەرسڤا وی دا و بێشڤە چوو....

- کانێ مەرێ و داسێ بینە دا ببەم سەقا بکەم و بچم رەزێ بکەزیخم و بکولم و پیژانێ وی چیکەم، ئەڤەنە خەلك هەمی یێت چنە ناڤ رەزێت خو، ئەز ژی دێ چمە ناڤ رەزی.

- ئەرێ بخودێ بابێ دلوڤانی تو راست دبێژی، بەلێ ما بیرا تە ناهێت، بار تە چەند خوب وی رەزیڤە وەستاند، تە چەند زحمەت پیڤە بر، تە گیانێ خو پێڤە خار هەتا هاتیە خارنێ، بەلێ دوماهیکێ بو چاویرا دزا و بیانیا، نە مە چو ژێ خار و نە مە چو ژێ دیت.

هوسا گولێ بەرسڤا وی دا و چوو مەر و داس ئینان دانە ڤێ.

- نە گولێ نە... پار وەسا بوو ئەڤ سالە وەسا نابیت.

- دێ باشە هەرە خودێ لگەل تە بیت.

رەزڤان چوو مەر و داسێت خو سەقا کرن و خو بەردا بناڤ رەزی دا و دەست بکەزاخ و کولان و پێچانا رەزی کر، هەر وکارێ وی بو سەخبێر کرنا رەزی. سێ چار هەیف پێڤە چوون رەزڤان هەرێ برەزی مژیلە و بزاڤێ لێ دکەت دا کومڤایەکی ژی بکەت و کێماتییێت مالا خو یێ چارەسەر بکەت.

- گولێ ئەڤ سالە رەزێ مە گەلەکێ باشە، تریەکێ مشە یێ پیڤە هاتی، هندی بخوین و بدەینە هەژار و هەڤدەرا خلاس نابیت، دێ گەلەکێ ژێ فروشین، حەفت تێری مە هەیە، دێ ئەڤ سالە یێ خنی بین، چونکو هەمی کیماتییێت مالێ دێ پێ چێ بن.

- ئەرێ بەوەر بکە بابێ دلوڤانی، رەزێ مە ئەڤ سالە گەلەکێ جوانە و تریەکێ گەلەك زەر و زەلال یێ پیڤە هاتی، بەلێ ئەز ڤێ ئێڤارێ چووم ناڤ من هندەك میو دیتن، تیرك و شاکێت وان یێت قراندین و تریێ وان هندی خارێ یێ خاری و هندی برێ یێ بری، ئەوێ مای ژی هەمی لبەرپیا مەرچاندی و بژکاندی‌یە واندرا.

- ئەو چەوا ئەو چەوا.....! کچێ گولێ تو چ دبێژی؟ کینە چوینە ناڤ؟ ما یێ بێ خودانە؟ ئەڤە ژ سەرێ بهارێ هەتا نوکە ئەز پالێ وی رەزیمە و من دەستێت خو یێت پیڤە تیڤلاندین، بخودێ ئەڤ شەڤە ئەز دێ چمە بەر، ئەڤە هوسا چێ نابیت، من خو بوی رەزیڤە نیڤ رح کری و ئینایە خارنێ، هندەکێت دی یێ خوش ببن و بەرێ وی بخون، بەلێ چو بکەم من تڤەنگ نینە لگەل خو ببەم، بەلێ هەر دێ چم دا بزانم کانێ ئەو کینە ڤێ بسەرێ من تینن.

- ئز دبێژم بابێ دلوڤانی نەچە، تو یێ بتنێ و تە چو چەك نینن، وەرە ژێڤەبە، نێ بهارێ من گوتە تە نە چێکە بلا وەسا بیت، دێ خودێ بو مە قەتینیت، تە گوت نەء نا قەتیت.

- نە نە هەر دێ چم و ئەڤە ئەز چووم.

- کەیفا تەیە، بخێر بچی، وەغەرا خێرێ بیت، بەلێ بەهشیاری بچی ها.....

گولێ هەر هات و چوو، لسەربانی، لسە دەرازینکێ، خەوا وێ نە هات، ما گوهـ ڤەچنی هەتا بوویە درەنگی شەڤێ.

- ئها... ئەڤە چ تەقین بوو ژناڤ رەزێ مە هاتی؟ گولێ ئەڤ چەند پەیڤەنە بو خو گوتن و دەرکەفتە ژ دەرڤە، ل هەڤدەر گوندیا گەریا.

- هوین بخودێ کەنە کانێ سەمکەنە ناڤ رەزێ مە، نوکە دەنگێ تڤەنگەکێ ژ وێڤە هات، کانێ ئەو چ دەنگ بوو؟ رۆژئاڤا بابێ دلوڤانی یێ چوویە بەر رەزی و نەهاتی‌یەڤە، ئەڤە نیڤەکا شەڤێ‌یە، ئەو هەر یێ بێ ئەگەر نینە، هەکە نوکە هاتباڤە. سەردار و شڤان دووگەنج بوون، هەڤدەرێت وان بوون، هەما سڤك رابوون، خو کار کرن و هاتنە ژ دەرڤە و گوتن:-

- باشە دایکا دلوڤانی تو گەلەك بخێر هاتی، ئەڤە ئەم چوین،

بەلێ نە ترسە، چو هزرا نە کە چو نینە، نوکە دێ زڤرینەڤە. شەڤە و بێ دەنگی و تاریێ رەزێ وەرپێچای، هندی بەرێ خو دەنێ چونا بینن، هندی گوهێ خودەنێ نە گزگز و نە پێژن ژ ناڤ رەزی ناهێن. دەمەکێ سەردار لسەر ملێ خو زڤری و

- گوت: شڤـان، شڤـان کا خوبچەمینە، بەرێ خوبدە ناڤبەرا وان مێـوێت هەنێ، یا ژ منڤـە رەشـاتیەك یا لوێرێ، کا ئەوچ رەشاتیە؟ شڤان شەش حەفت پێنگاڤەکا چوو وێڤە، بەرێ خو دایێ رەزڤـان یێ کوشتی‌یـە، تەزینکەك بسەر لەشێ وێدا چوو خارێ و گوت:

- ئاخ... ئاخ، برا سەردار ئەڤـە کەلـەخێ رەزڤـانی‌یـە، یێ هاتی‌یە کوشتن، بخارن و برینا رەزی رازی نە بوونە، کەرب و کینا خو یا دارێتی‌یە مێلاکێت ڤێ بێ خودانی.

- ئەی هوئەی هو... برا شڤـان ئەڤـە حالێ مە هەژارانـە، ددەستێت دز و زوردار و نە یارادا، دسەر دزین و خارن و تالان کرنێ را، کوشتن هەر بەهرا مەیە، ئاخ هزار جار ئاخ، دێ برا ما چوبکـەین، چوژ مە تێت، نە زەنـدێت مە سـتوینا زوردارا دبرن، نە ڤیری و پێلێت دەنگێ مە بها هەیە، گوهێت پێ چێ بووی بکرن.

سەردار و شڤان، بێ رەنگ شەپلی و دا مای زڤرینەڤە مال. گولێ خەوا وێ ناهێت، هەرا تێت ودچیت وچاڤـە رێ‌یــە، دەمەکێ بەرێ خو دایێ.

- وێ... تە نە یێت هاتن، بەلێ هەروەکی خوش برێڤە نا هێن.

بێهنەکا دی هات وچوو، هەتا نێزیك بووین، بەری خو دایێ بەس دوو کەسن تێن، گولێ پێشڤــە چوو بابێ دلـوڤــانی نە دیـت، - کرە قیــری و هەوار، ها سەردار ها شڤــان.... کا بابێ دلـوڤـانی؟ رونـدك بچـاڤـا دا هاتنـە خارێ و سەرێ خو ڤەچری و ژ دلێ خوێ بریندار هەر نالی.....
شڤانی و سەرداری بئاخینکڤە بەرسڤا وێ دا.

- بابێ دلـوڤـانی گیـانێ خوێ پیـروز گوری ئاخا خو کر، دزا کوشت دزا، زوردارا.... ئەڤە چەند سالە، حالێ مە هەژارا ئەڤەیە، هێشتا مە خوشی بچاڤێت خو نە دیتینە، هێشتا لێڤێت مە گرنژ ینە، هێشتا دەرازینکێت مە ژ خوینێ پاڤژ نە بووینە. ئەڤێ خەما مەزن جارەکا دی گوندێ وان داعیرا. ژ یێ دلوڤانی دەهـ سالن، سێـپێدێ ژ خەو رابوو، لواندرا گریا و هات وچوو بابێ خو نە دیت.

- دادێ دادێ کانێ بابێ من؟

- دای گوری سپێـدێ زوی بابێ تە یێ چوویـە کاروانی. سێ چار رۆژ پێڤە چوون، رۆژەکێ دلوڤان بهێن هەلمای هاتە مال و گازی دایکا خو کر.

- ئەز ئەڤروکە چووم ناڤ رەزێ مە، هندەکا ترێ مە دچنی و مێوێت مە دبرین، پا کانێ بابێ من نە زڤری‌ڤە ژ کاروانی؟ دا خەلکی ژناڤ بکەت دەری.

بوو ئوف ئوفا دایکا وی و کرە گری و روندك بچاڤا دا هاتن خارێ.

- چی‌یە دایێ؟ بوچی تو دکەیە گری؟

- داوو ئەگـەر بابێ تە یێ ساخ با، ئەڤروکە رەز نە دبوو چەوارا بیـانیـا و دزا و تالان کەرا، هەمیـا پێکڤـە نە بەردداییێ، راستـە کورێ من بابێ تە کاروانی‌یە و قوناغا وی یا دویرە، زڤرین نینە.

- چەوا دایێ؟ پا بوچی تە نە دگوتە من؟

- کورێ من بابێ تە لناڤ وی رەزی یێ هاتیە کوشتن.

- لناڤ رەزی هاتیە کوشتن! پا ئەز بوێ ئاخێ کەمە، ئەوا بابێ من بخوینا خو ئاڤدای و سەرێ خودا نایە ناڤ، یان ئەز وێ ژ دەستێت دز و زوردار و تالان کەرا بپارێزم، یان ئەز ژی سەرێ خو دانمە ناڤ ئاخا وی رەزێ بابێ من سەرێ خودا نایە ناڤ.

# چیروکا شڤانی

ابراهيم علي هاجاني

هەبی نەبی چ خودێ و بەنیـا مەزنتـر نەبی ئێـك هەبی دگـوتنێ سولتان مەحمود، سولتانێ دینێ بوسلمانەتی ێ بی . ناڤێ وی بتـەمـامی (سولتان مەحمودبی)ددەمێ وی‌دا دوژمنایەتی و نەخـوشی پەیـدابی گەلەك وناڤ بوسلمانەتی‌یێ دا. رۆژەکێ ژ رۆژان سولتان مەحمودی گوت: وەزیرێ خوە یێ ملێ راستێ وێ هلورابە دائەم رابین جلکێت خوە یێت سولتانی‌یێ ژ بەرخو بکـەین دەستەك جلکێت دی بکەنیە بەرخوە یێت رینجبەری‌یێ بن دائـەم گەرهـانـەکێ بکـەین لناڤ باژێریت بۆسلمانا کاچ هەیە؟چ نینە؟

وەختێ خوە کارکرن رابین برێکەتن قەدەرەکێ چەند رۆژان ئەو ئەو هەیڤـەکێ بەردەوام بین دگـەرهـانا خودە. چوو تشت گولێ نەبین وچوو نەزانین ،چوو نەدیتن، دناڤەکێ‌رە یێ برێڤە دچن سولتانی بەرێ خودا پیشیاخوە

کەهنیـەك ئاڤێ کەت درێکـا وی‌دا وکـەرەك پەربی‌یێ هـاتی‌یە سەر ئاڤێ مەخـەلی سولتـانی بەرێ خودا کەهنیێ شڤانەك یێل بەر پەزێ خوە سولتـان مەحمـودی گوت! شڤانو خودێ قەوەتێ شڤـانی ڤەگێـرا گوت: رەحمـەل دەیبـابێت وەبن . سـولتـان مەحمـودی گوت : شڤـانی مروڤ شڤـانا بچی ناس دکەت ؟ شڤـانی لێ ڤەگێـرا گوتێ یاشڤانا نان وشیرە رابی شڤان دەست هاڤێت ترارێ خوە چونـك پەزەکێ شیـر بو سولتـانی و وەزیـرێ وی دووت . ئینـا دەینـا بەر سولتـانی و وەزیرێ وی، سولتانی و وەزیری وی بەرێ خودایە سەرهندڤێ کەهنی‌یێ دارەك یال ، هنداڤ کەهنی‌یێ سەیەك یێ پێ‌ڤە هلاویستی‌یە دوی دەمی‌دە سولتـان مەحمـودو وەزیـری وی نان و شیر دخارن دەمێ چاڤێ وان بووێ دارێ کەتی و وی صەیێ پێڤـە یەکسـەر راوەستـان سولتـان مەحمـودی گوت: شڤانی ناڤێ تە چی‌یە؟شڤانی ژ ی گوت: نـاڤی من عەلی شڤـانـە . سـولتـانی گوت عەلی شڤان بۆ بۆچی؟تەئەڤ صەیەهلا ویستیە بدارێ‌ڤە؟ شڤانی ژ ی گوت: گەلی دەروێشا نان و شیرێ خوەبخون وە شول پێ نینە ڤێ چیـروکێ چیـروکـا (صـەیی)سـولتـان مەحمودی گوت : شڤـان ئەم نانێ تە ناخـوین حەتـا توچیـروکـا (صەیی)بۆمەنە بێـژ ێ . شڤـانی گوت: دەروێشا هەکەر سولتان مەحمود دگەل وەبت ئەز بۆ هەوە نابێـــژم ددەمـەکێ‌رە سولتـان مەحمـود رابی سەرخـوە روتبەو نیشانێت خوەنیشا شڤانی داشڤانی ژ ی گوتە: دەروێشا نێ من جارا ئێکێ گوتە هەوە هەکەر سولتان مەحمود دگـەل هەبت ئەز بۆوە نابێژم، دنـاڤـەکێ‌رە سولتـان مەحمودو وەزیرێ وی وهەڤالێت وی یێ دگەلدا رابین چون نان و شیرێ شڤـانێ هێـلان نیڤ تەمـام نەخارن رابین خاترا خوە ژ شڤانی خاستن سولتــانی گوت: وزیـرێ خوەوێت دگـەل دە دارابین برێکـەڤین سولتـانی ناڤێ شڤـانی و چیروکا وی هەمی نڤێسی لسەر پەرکەکێ کاغزێ لنك خوە هەل گرت رابین چوون قەستا جهێ خوە کرن پایتەختێ خونکاری‌یێ باژێرێ ئیستەمبولێ ئەو بەرێ دگـوتێ (ئـەستـانێ)چو سەر تەختێ خوە رنیشت خارێ گازی قولچێت خوە کرن گوتـە وانـا ها ئەهـا من ژهـەوە دڤێت ئەڤ مروڤـە یێ من ناڤێ نڤێس لدەڤ خوە ناڤێ وی (عــەلی شڤــانــە )ل کیڤــە بت بینن ، قولچی رابین ل هەسپێت خوە سیاربین برێکەتن دەرکەتن ژ ئیستەمبولێ گەرهان پسوو پسیارا گەهشتن جهێ عەلی شڤـان لێ . چونـە مالا وی گوتنێ عەلی شڤـان حالـو مەسـەلا مەو سولتـانی ئەڤـەیـە سولتـانی ئەمێت هنــارتین بۆنك تە تە دگــەل خوببین عەلی شڤــان سولتـانی یاگوتی: هوین عەلی شڤانی ژکیڤە بینن من ژ وە دڤێت عەلی شڤـانی ژ ی گوت بلا ئەز وێ دگـەل هەوە قولچێیت سولتـانی عەلی شڤان دان پێشیا خوە برن وچوون قوناغ قوناغ برن حەتا گەهشتن بنـەجهێ قەستـا باژێـرێ ئیستـەمبولێ‌کرن وەختێ نێــزیکی قەسـرا سولتـان مەحمـودی بین قولچێیت سولتـانی

رێـدان شڤـانی گوتنێ ئەڤەجهێ سولتانی‌یە دناڤەکێ رە عەلی شڤـان چوو بەر دەگـەهێ قەسـرێ عەلی شڤـانی گوت دەرگەهڤـانی دەستیـریـە ژ وە ئەزێ بچم دەڤ سولتانی یا ڤرێ کری دیڤ من رە، دەرگـــەهڤـانی ژی گوت عەلی‌شڤـانی راوەستـا ئەزێ چم بیـژم سولتـانی دەستری یێ‌ژێ خازم بۆتە داتوبچێ ژ وورێ دەڤ وی عەلی شڤـانی ژی گوت بلانێ دەرگـەهڤان ئەوخولام دبێـــژێ زڤـــری گوت : عەلی شڤـــانی کەرمکـــە سولتـــانی یاگـوتی بلا بێت ژووری دەسێـری‌یـە بووی عەلی شڤـان چووی‌یە ژ وورێ ژ وورا سولتانێ سلاڤ کرێ‌سولتانی ژی سلاڤـا وی ژێ وەرگـرت گوتێ توبخێر هاتی عەلی شڤان عەلی شڤـانی ژی لێ‌ڤـە گێـراو گوتێ خودێ ژتـە رازی بت یا سولتـان، سولتـانی ژی گوتـە عەلی شڤـانی دێ بێژە چیروکا (صـەی) یا خوە عەلی شڤـانی گوت : ئەزبەنی ئەز بۆتە نابێژم سولتانی گازی ئێلچیا کر گوتە وان وەرن عەلی شڤانی ببن بێ خنـە دبـەندیخانێ ڤە ئێلچی رابین عەلی شڤان دان پێشیا خوە برن کرنـــە ت حەبسێ ڤە قەدەرێ چەنـــد رۆژەکـا ، جارەکـا دی‌سولتان مەحمودی گازی قولچێت خوە کرن گوتەوان هەرن شڤـــانی بینن دەرێ ژحـەپسێ ئەوبەنـدیخـانێ قولچی رابین چوون شڤـــان ئینـــان دەرژ بەنـــدی خانێ برن دەڤ سولتـــان مەحمـــودی سولتـــانێ گوت : شڤـــانی‌دێ بێـــژە چیـــروکـــا وی(صـەی)شڤـانی گوت ئەز نابێژم بۆتە هەکەر تو سەرێ من لێ بدەی.

ئینـا سولتـان مەحـودی گازی وزیرێ خوە کر ێی ملێ راستێ‌و چەپێ گوتـە وان هوین چی دبێـژ ن؟ ئەڤە چیروکا صەی بۆمن نابێـژت یابـۆمن ژی بی‌یـە مەرەق دڤێت ئەزبـزانم وەزیرا لێ ڤەگێـرار وگـوتی سولتـان ئەزبەنی هەکەر توکچا خوە بدەی وی بەلکی بۆکچـــا تە بێـژت . سولتـانی گازی عەلی شڤـانی کر گوتی عەلێ شڤان وەرە دەستێ من من کچا خوە پێش کێش تە کر تە پیروژ بت، ئەڤە قەسرەك ژی بۆتە داتوتێ‌ڤە ببێ زاڤا . عەلی شڤـــان ژی چووی‌یـــە دەستێ سولتـانی کچـا وی ژی قەبیل کر، دەمێ عەلی شڤان چووی دەستێ سولتانی کچاوی ژی قەبیل کری سولتانی ژی گوت عەلی شڤانی دێ هلورابە دەستـەك جلکێت نوی بکـە بەرخـوە بێت (حاکما)شڤان ژی رابی جلکێت(حـاکمـا)کـرنە بەرخوە سولتان ژی رابی بئەمرو شریعـەت کچـا خوەلی مەهر کر کچا خوە گوهاست بر دقەسرا وان ڤە . دشەڤا زاڤانی یێ داکچا سولتانی پسیار ژعەلی شڤانی کر گوتێ : ئەوچ؟ چیروکا تەبۆبابێ من کری‌یە مەرەق توبۆوی نابێـژی دەمێ کچـا سولتـانی وەگوتە عەلی شڤانی مێرێ خوە عەلی شڤـان رابی دەست هاڤێت حەیـزەرانەکێ ئەوحەیزەران دەنیـا ناڤ قولنجێت ژ ناخوە کچا سولتانی عەلی شڤانی گوت کچکێ ژنـاخـومن حەتـا نوکـە بۆکەس نە گوتی‌یـەووە من بۆ بابێ‌تـە نەگـوتی‌یـە ڤێجـا ئەزێ، چاوا بۆتەبێژم دەمێ بی‌یە رۆژ سولـتـــان مەحمـــودی گازی کچـــا خوە کر گوتێ : کچـــا من مالخـوێ‌تـە چ گوت بەحسێ چیـروکـا (صەێ)کر بۆتەیان نە؟ کچکێ گوت بابـوئەڤـە چ؟ بێ تیتـەیە ئەوبێ تەبیعە تە تە ئەز دایمێ دەمێ من وەگـوتێ بۆمن .بێژە چیـروکـا(صەیی)ئەوی لمن ڤەگێـرا وگـوت من حەتـا نوکـە بۆبابێ تە نە گوتی یە ڤێجا ئەزێ بۆبێژم رابی ئەوحەیزەران دەینا ناڤ قولنجێت من . قولـنـجێت من یێت رەش دشین کرین چنکی من پسیـــار ژێ کر. سولتانی جارەکا دی گازی عەلی شڤانی گوتێ : بۆچی تو هندەی مەژی هشکێ تودێ سوحبەتا (صەی)بۆمن نابێژی من دڤێت نوکـــە توبێـــژێ عەلی شڤـان عەلی شڤـانی ژی گوتێ سولتان مەحمود رابە روتبە ونیشانێت بتەڤە دەنیە ئەز دێ هلگرم وە دەستیـریـیـا من بدە چ تشتێ من کرنـە ئاخڤـە سولتانی ژی گوت بلا رابی چوخوە هنـــداکــــر. ئیڤاری گازی کرە هەمی وەزیـرێت خوە ئەوێت لبـاژ یرێ ئیستە مبولێ کوم کرن ئیڤاری کوچـك بووان ڤالـەکر سەعەتەکێ ئاخفتن بی‌یە گەنگەشا وان حەتـا کەس نەمـا ل کوچکێ ژغێـری وەزیرا زێدە عەلی شڤان گوت گەلی وەزیرا ئەڤ سولتانێ هەنێ نەژدینێ هەوەیە هەمی وەزیرا لێ ڤەگێراو گوتن

پانێ مەئەڤ تشتە نەدزانی سولتانی ژی هەمی وەزیر جیربأندن گوتن وەزیرێت خوە ئەز نەژدینی هەوە مە وەزیرا ژی لێ ڤەگێرا گوتن سولتانی پا خونکار مادەم تو نەژدینێ مەیێ هەما تو لسەر کیش دینی بێ ئەم ژی لســـەروی دینی نـــە سولتـــانی گوتـــە وەزیـــرێت خوە دێ کەرمکن هەرن مالێت خوە سوبـەهی هەر

ئێكی ژ وه تێرا خوه مه شروباتی دگه‌ل خوبینن بی رۆژا دی
هه‌می وه‌زیر هاتن قه‌ستا دیوانخانا سولتانی کرن ئه‌و دبێژنێ
کوچـك ودیـوان هه‌ر ئێکێ ژ وان دجهێ خوه رینشت خارێ

بی‌یه سوحبه‌تا وه‌زیراو سولتانی پشتی هینگێ ده‌ست هاڤێن
خارن ڤه‌خـارنـا عه‌ره‌قێ و هه‌می ره‌نگێت مه‌شـروبێ ده‌مێ
ده‌ست پێ کرین ڤه‌رخانێ یامه‌شروبی وه‌زیرا هه‌می یا ره‌نگێت

مه‌شـروبـا ئینابین دگه‌ل خوه، به‌لێ مه‌شـروبێ سولتـانی
شه‌ربه‌ت بی یا (عـادي)ئینـابی ڤه‌دخـار ده‌مێ وه‌زیـرا هه‌میا
ڤه‌خاری‌و هه‌می سه‌رخۆش بین نه‌هشیاربین که‌تن دديوانخانێ

ڤه هه‌رئێـکێ ژ وان دجهێ خوه که‌تـه سه‌رجهێ خوه. به‌لێ
سولتـان تنێ مال سه‌رهشـو بیـرێت خوه، سولتـان رابی هه‌می
وه‌زیـرێت خوه سه‌رژێ کرن په‌نتـه‌رونێت هه‌چیـا ڤه‌کـر ئیناته

خارێ دیوان ده هێلایه وه‌سا دديوانخانێ ڤه‌ده‌رگه‌ت ژ ده‌رڤه‌ی
کوچـکـێ چورتبـه‌و نیشـانێت خوه ژ بـه‌ر خوه کرن گازی
سولتـانی کـر گوتێ: دی وه‌ره رینـه خارێ لسـه‌رتـه‌ختێ خوه

سولتـان مه‌حمود ئه‌زێ ژنوی بوته بێژم چیروکا (صه‌بی)عه‌لێ
شڤانی بالاده‌ستێ سولتانێ بره دکوچکێ ڤه ده‌رکه‌هـ بوڤه‌کر.
سولتـانی چ به‌رێ خودده‌تێ هه‌می سه‌رژێ کرینـه په‌نتـه

رونێـت وان هه‌مـی یێـت هاتین خارێ دبێت وانـدا. ده‌مێ
سولتـانێ به‌رێ خودای‌وانـا گوت هه‌می هاته‌ڤه سه‌رێ چه‌ند
سالانـه من نه‌دزانی وه‌زیـرێت من هه‌می نه‌ژدینێ مه‌نن هه‌می

نه‌سـونه‌ت کرینه ئینا سولتان مه‌حمودی بالا ده‌ستێ شڤانی کر
ئه‌نیـا وی ماچی کر عه‌لی شڤـانی ژی ماچی کر سولتـان،
سولتان رینشت خارێ‌لسه‌ر کورسیکا خوه گوت دێ وه‌ره عه‌لی

شڤـان ژنـوی بێـژه بۆمن چیـروکـا (صـه‌بی)هنده بۆمن بی‌یه
مه‌ره‌ق عه‌لی شڤانی گوت میرم ئه‌و(صه‌بێ)من بی گه‌له‌ك بێ

ساخـلـه‌م بی هه‌رده‌م دگـه‌ل من بی ئه‌وی گوهـێ خوه ددایـه
په‌زێ من هه‌کـه‌ر به‌زکیڤـه چویـا ئه‌ز دگه‌ل بام ئه‌ویی شینا من
شڤـان گوهێ خوه ددایی عه‌لی گوت: رۆژکێ من که‌پـه‌نـه‌ك
هه‌بی من ده‌ینا بی دبن سه‌رێ‌خـوه‌ڤـه من گوت ئه‌زێ بچه‌ك

نڤم من ژی په‌زێ به‌ردا من گوهێ‌خـوه نه‌دایێ دنـاڤه‌کێ ره من

هنـد دیت بی‌یـه ڤیـرو هه‌وارو ده‌نگ دناڤ که‌رێ په‌زێ من دا
بی‌یـه پرکێ پر به‌لاڤێ من داخـه‌و ئه‌ز رابیم به‌رێ خودده‌مێ

ده‌هـ گورك یێـت هاتـیـن دنـاڤ که‌رێ په‌زێ من دا هه‌ر
گورگـه‌کێ ده‌ڤێ خوه یاهـاڤیتێ ستوێ په‌زه‌کێ دڤێت ڤه‌کوژت

بخوت ئێك ژی یا دده‌مێ صه‌بێ من دا ئه‌وژی دڤێت ئێك ڤه
کوژیت بخوت ئه‌ز ژی رابیم که‌تم دیڤ گورگا من ته‌رقاندن ئه‌ز

به‌زیم (صـه‌بێ) من وه‌ریسـه‌ك ئێخستـه حه‌فکا وی ئه‌وستوێ
ڤه‌من گرێدا بدارێ‌ڤه‌من هلاویـسـت عه‌لی گوت سولتـانی

ئه‌ڤـه‌بی چیروکا من (صه‌بی)من گوت هه‌بت نه‌بت وه‌زیرێت
سولتـان مه‌حمـودی یێت خائین بین ل سولتانی، هه‌بت نه‌بت

ژ بـه‌ر هنـدێ صه‌بێ‌من ژی یێـل من خائین بی، پشتی ڤێ
هه‌می سولتان مه‌حمود رابی عه‌لی شڤان کره وه‌زیرێ خوه بێ

ملێ راستێ ئه‌وێ ئێکی.

هه‌تـا ڤێـرێ ئه‌ڤ چیـروکـا هه‌نێ یا فلکلوری بدیمـاهیـك
ره‌حمه‌ت ل ده‌یابێت من و هه‌می خانده‌ڤانا

په‌راوێز

١ـ ئه‌ڤ چیروکه من یاوه‌ر گرتی ژ ده‌ڤێ ره‌حمه‌تی‌یێ بابێ خوه
خودێ ژێ‌رازبیت، بێ چووی به‌ر دلـوڤـانـیـا خودێ سالا
١٩٨٠ لزاخوێ لگوندێ بێتاسێ



چیرۆك

# لووره لوور



عبدالرحمن کاکل

تریفەی مانگی ئەم شەوە درەنگ وەختە لەگەڵ هەنگاوەکانتا دەتوایەوە. تا وای لێ هات بەشی دیارکردنی شوێن دانانی پێیەکانتی نەدەکرد. جارجارەش نیگات بەرەو ئاسمانی ساماڵی ئەیلول هەڵدەبڕی ، لەڕووی زەردی مانگی نزیك ئاسۆورد دەبوویەوە. تۆبەکوڵی هیواوە هەورازەکەی بەردەمت بەرەوژوور هەڵ دەپێچا، ئەویش بێباك لەخۆیو لەکەس بەرەو ئاسۆی ون بوون هەڵ دەکشا:

دەت ویست تادەنگت هەیە هاواری بکەێ:

- «بۆوابەپەلەی لەم کۆچە؟ ئەی هاودەردی [بێکەس]، چ ترسێك واچۆکت پێ دادەدا سەر بۆون بوون شۆڕدەکەی،خۆ هەردووکمان دوو ڕێبواری عاشق و تەنیای نێو نیوەشەوی ئەم گەردوونە جەنجاڵ و پڕلەنهێنییەین»بەڵام (ویستت) لەنێو قاوغی نەویستنەوە پێچایەوە لەسەر شێلانی توولەڕێگا پێچاو پێچەکەو بەردەوام بووی تا هەورازەکەت بەترۆپك گەیاند، ئەوسا هەستت بەتۆزێك ئارامی کرد. چاوێکت بەڕێگا داکشاوەکە داخشاندەوە تابناری هەورازەکە.

سەیرێکی کاژێرەکەی مەچەکت کرد:

«باش هاتم هێشتا زووە ، حەقی پشوێکی چارەکە سەعاتیم هەیە». شنەبایەکی فێنك خۆی لەجەستەت دەخشاند ، ئەلهای حەسانەوەی زیاتر کردی. ویستت هەر لەشوێنی خۆت خۆتی لێ بخەیە سەرگازی پشت،بەلام دەنگی سەگ وەڕێکی دوور سەرنجی راکێشای! هەموو ئەندامی لەشت کردنە گوێ: «ئەم سەگەلە نەگبەتیانە بەم ناوەختە شتێکیان لەچاودایە»سەرێکت بەرەو ئاسۆ هەڵ بریەوە، مانگی کزو رووزەرد لەودیو زوورگەکەوە سەرەتاتکێی ون بوونی لەگەڵدا دەکردی،وات هەست دەکرد گاڵتەت پێ دەکا: «ئەی مانگ تۆبلێی من هەڵەبم و هەمان تووڵە ڕێی تۆ هەڵم نەپێچێ؟! قەت باوەر ناکەم!»

خۆت تەیار کردوو رووەو،شێوەکە گلۆربوویەوە تاکو دۆڵە ئاو دریوەکە هەڵی لووشیی،بە چەند دەقیقەیەك خۆت پەلکێشی گردۆلکەکەی ئەوبەرکرد. هەر هەنگاوێك بەرەوپێش دەنگە بەسام و دڵ لەرزێنەکە زیاتر دەی تەزاندی، موچورکی رەزمێکی پەنهانیی بەلەشتدا پەخش دەکرد؛

ـ «ئەمەچ وەرینێکە خۆ هەرهەمووبان بەجارێ تێیان هەڵکردووە دەڵێی کۆرسی دەنگێکی غەیبن!»

هەرچەندە تۆیەکەم کەس بووی لەنێوهاوڕێکانتا بەرپەرچی ئەم شتە پروپووچانەت دەدایەوە. گەریەکێك بهسی راستی شتێکی وای بۆبکردبای گاڵتەت پێ دەهات . بەلام دڵت دەترسا نەك لەراستی مەسەلەکە بەڵکو لە باوەرە ـ

ـ کۆمەلایەتیەکە. بەدەم رۆیشتنەوە کەوتیە دەربرینی ئەو وشەلول و پێچ دراوانەی لەزەریای بیرکردنەوەت دا شەپۆلیان ئەدا : «گەربەم حالەبێ ئەوجارە بەگیانی یەکێك ودووانەوە ناوەستێ و، قری تێ دەخا تۆبلێی فەلەك هێندەبێ بەزەیی بێ؟.. بۆنالێی..!

ـ هەرچۆنێ بێ من هەرگاڵتەم پێ هاتووەو هەر گاڵتەشم پێ دێت،مەسەلەکە هەمووی بەندە بەخودی مرۆڤ خۆیەوە لەم بارەش داپەیوەندیەکە هەر خۆراگرتنەو. برایەوە»

کەگەیشتیە پەرگەی ئاوەدانی ، سام وترسێکی لە رادەبەدەر چنگی رەشی لەبینی خەڵکەکە نابوو، کەدیدەت بەودیمەنە شومە ئاشنابوو دڵت وەك چۆلەکەی سەربراو ئۆقرەی نەدەگرت، خوێنی سوروگەشی دەرژاندەنێوپێکی مەرگ ونەگبەتی یەوە: «دەتیربخۆن.. گەربە خوێنی من تێردەبن، وەرن! چنگی رەشتان بکێشنەوە، ئەوەتام من واتە ریك لەوان وەستاوم»لووری سەگەلەکە دڵیان ژەمینیان دەهەژاند ، قاوو قریوەی خەڵکە رووزەردەکەش لەمەزاتخانەیەکی کێ بەرکێ دەچوو. هەزارویەك پرسیارلە کاسەی سەرت دا گینگڵیان دەخوارد : «سەیرە! جاران: . نەم دەهێشت حەپەی سەگیش خەوی شەوی ئارامیان هەراسان بکەن کەچی..»تۆزێك پێرێ لێ هەلبری تاخۆت کوتایە جەرگەی ئاوەدانی یەکەو حەزت نەکرد پرسیار لەکەس بکەی، یەکسەر بەرەو شوێنی مەبەست هەنگاوت نا. کەدەرگا بچوکەکەی حەوشەیانت لێ دەرکەوت :

تەواوتی گەیشتی کەهاتنی ئەم جارەت بۆژ ووانی خەمێکی دەگمەنە! ئەوەتا دەبووایە ئێستا تیشکی چاوەشین ومەنگەکانی هەرلەدوورەوەپێشوازیان بکردبای و ماتی کولمەکانیشی بۆتی گرتنی پەلالارە ماچ خۆش کردبا ، بزەیەکی نەرم لەسەر رووی گەشی ئەوشەکە نێی ڕێگای هەورازو نشێوی تۆی گۆ ر کردبا بەلام : هەیهوو. هەیهووتازە ئەوامانگیش ئاوا بوو.. نەنەرمە نیگاو نەخەندەوبزەونەوشەی خورپەدارت نەدیت ونەبیست . خۆت بۆنەگیرا دەرگای حەوشەکەت یەك لاکردوو بەژ وور کەوتی! لەجێگای خۆت وەك بت لەجوولە کەوتی: چاوت یەك یەك بەگۆری هەڵکەندراوی هیواو ئاواتە جوانەمەرگ کراوەکانتدا دەخشاند! ئەویش بێ نازانە تەماشایەکی کردیو کەم ساتێك نیگای لەسەر رووخساری

شێواوت بۆرژا . چەند وشەیەکی پچرپچری لەسەر لێوەکانی بەرەورووت هەڵفراند«...»

ئۆقرەت نەگرت، رووی دەمت کردەباوکی :

«خالەگیان تێم ناگەیەنی ئەوەچی رووی داوە؟!»

ئەویش بەبێزاریەوە کۆکەیەکی بۆکردووبەدەنگێکی لاوازو تەڵخەوەوتی: «کورم گوێت لەلوورەی سەگەل نیە چیمان پێ دەڵێن!»

ئێستا تەواو دڵنیابووی؟ کەچۆنی بۆچووبووی وادەرچو!!بێ هودەلە حەوشە بچوکەکە خۆلە پۆکت دەپەستایەوە. هەناسەسواروبێ ئارام لەگەردوونێکی بێ ئۆکسجین دا دەژیای، سەراپای جەستەت گرکانێکی بێ بواربوو:

هەست، هۆش، بیر:
ئاسکەکێویەکی سرك بوو ، بەهەوانتە بۆت بەیدەست نەدەکرا هەستت دەکـرد: دەستێـك کەپـەنجـەکـانی تەنهـا ئێسـك و جومگـەن دڵت ڕادەگـوشێ. حەزت دەکـرد تاهێـزت تیـایـە هاواربکـەی : «نـەمـرونـەژ ییـەکان فریام کەون واگرم گرت، وادڵـم تەقـی کـرد، ئۆکسـجـین . . ئۆکسجین . »زیـاتـرو زیـاتـرتەکانت دەدایە بەرخۆت تادەنگت بگەیەنیە کەشکەلانی فەلـەك . بـەلام زمـانت چووبـوەکلیلە لاڵ بووبوی هیچت بۆ دەرنەدەبراو ، گەرووت دەبووە گۆڕی مەرگی هاوارەکانت.

ئاسمـــان ، زەوی ئەستێـرەکـان دارو دیـوارو برو بزگـورپ کەڵـەکەکراوە کانیش لەبەرچاوت میوانی حەوشەکە بوون وقاقا پێ دەکـەنین و دەیـان گوت : «هـەی کلۆڵ ئەدی کێ فریـات بکەوێ ئەوە ئۆکسجین . . ئۆکسجینی چی‌تە؟!

هەی . . ! ئەوە تۆکەی واسپڵەبـووی ، هەرلـە خەمی خۆتدای بیربکەرەوە بیر . . ر . . ر»

تەزوویکی سارد لەتـەوقی سەرتـەوە هات و لە کەڵـەمـووچکی پێتـەوە دەرچـوو . هەمـوو جەستەی لەمەوبەر هەڵچووت ئێستا کپ و مێروولە دەکا!

ئەوجـــار ڕێچکـــەی شەپـــۆلی وشـــەی هاوارت گۆڕان وبوون بەپـەیـام، بەڕێگـا بەسـەر پردی لاشـەی ئەودا بەشێـوەیـەکی ترخۆی گەیاندە کەنارلێوانت : «ئەوە چ گەردوونێکی نەگریسە وا . . هۆ خەڵکینـــە : دەبـاسـەگ دەمیـان هەرزەلێ هەوکیـان بنـوسێ . هـەنـد بلووریێن کێ دەڵێ ئەوهەڵبـەستـە ڕاستـەو دەتـوانێ کاری خۆی بکات . دەبا جارێك بۆی بووەستین کێ دەڵێ خۆی لەچاڵـەکـە ناخـزێ ئەگـەریش نا دەبـاگیانی یەك دووانێکمـان قوربـانی گشت بێ . مەڕۆ . . مە . . ڕۆ . » . . —
گەرووت وەرچـەرخـانـد چنورو دایك و باوکی وخوشکە کەرو لاڵـــەکـــەشی بەتـرســەوە یەك چێـر تێ یـان دەڕووانی! خۆت بەشـەرمەزار زانی ، بەلام زانیت تازە کارلەکار ترازا وە هەرچی بوو بوو ناچـاربـــەدەنگێکی کزو نیمچـــە پارانـــەوە دووبـارەو سێ‌بارەت دەکردەوە: «مەڕۆ مەڕۆ . . »

ڕووت لەدیوارەگڵ و داتە پیوەکە کردەوە دەت وت بۆ تاریکیەکە دەدووێ: «چیم کردووە تاخـۆم بەشـەرمـەزار بزانم لەحـەق و لەراستی بەولاوە . دەبـا بەهـەرنـرخێـك بێ گرنـگ . . ئـەم نیگـەزانیـە گۆڕبکـرێ ئەوەی تۆ دەیکەی ڕاست نی‌یە هەلاتن لەژیان ، لەژیار . . لە . . و . . »-
«تووڵێ‌ی‌بیـرلـەچی بکاتەوە؟ لەئان و ساتێکی‌وا کەکات چەند وێنـــەیـەکی سینـەمـاییـەو بروسکـەئـاسـا دێت ورادەبـوورێ لەقسەکانی من؟ لەچارەنوس! کام چارەنوس؟!
تۆبلێ ی لەمـاوەی کوژانـدنـەوەی ئەوهـەموو مۆمەی ساڵانەی تەمەنی دا دڵۆپێك عارەقەی بۆ ئەم چارەنوسە هەڵ نەرژتبێ؟! بەرت کردەوە بەلای دیـوارە زبـرەکـەوە و «ئێ خۆمن ئامـادەم لەپێنـــاوی عەشقم دا دووا دڵـــۆپی خوێنم برژێنمـــە گوڵاوی شەتڵی گوڵەکانیانەوە . » . .

بەهەرحاڵ دوواجار هەڵت بۆرەخسا (چنور)لەجێ ژ ووانی گۆڕین بدوێنی . ئەوەتـــا هەردووك بەنـــدەئـــاســـا بەرامبـــەر چارەنوسی عەشقی پاکتان دابەجووتە چۆکتان داداوەو سەری سەربەخت کردنی بۆدادەنەوێنن.
حەزدەکـەی لەنـووکەوە دەست پێ بکە ئەوە بۆچەندەمین جارە نەخشـەتـایبەتیەکان هەڵدەوە شێنیتەوە. بەلام ئەوجارە دەتەوێ گشتی بێ و خالێ دەست پێ کردنـەکـەشی لەناولەپی تۆدابێ و نەهی ئەویش خامە: خۆڵ ، کاغەز : خاك ئەودەی گوت :
* ئەم جارە دەبا ؛ نەئاو، نەچیا نەتەلبەند، نەبنەسنورێ . .
* زۆر چاکە منیش دەڵێم دەبا ؛ نەحەزو نەئارەزووش قەڵەم : دارۆچکە
نەبنە . . .
*کەواتە هۆش.
* *ئـافـــەرین ، دەبـــا ئەودیـــدارەشمـــان ، نەدووا دیـدارو نەدابرانێکی دی‌بێ . .
هەردووك لەباوەشی یەکتردا فرین و بەرز فرین تابوون بەلوتکەو بەفـر، مانگیش پێشـوازی کردن و هەڵکشـایـەوە . لە وێشەوە بانگی ڕێبوارە هەڵەتەکانتان دەکردەوە :
«وەرن . . وەرن نەلـوتکـە هەڵتان دەدێرێنێ ، نەبەفری سپیش ڕوومەتی ناسکی منالان و دەست و پەنجەی قەڵەشتان دەتەزێنێ نەلوورەی سەگەلیش دەتان ڕەوێنێ »
هەولێر ـ ١٩٨٧

شیعر

# کورتە شیعرەکان

حەسیب قەرەداخی

### ١- کولوە بەفر

کولوە بەفرێ..
وەکوو پەپوولەی باڵ شکاو هاتە خوارێ
وتم: خوایە با قورس نەبێ
کلووی تری لێ نەبارێ
خێرا دەستم بۆ گرتەوە..
حەیفە بگاتە سەر عەردێ
ئەی عەردەکە، تووێژا لێکت خۆڵ و قوڕە،
لەدوای ئەوە تاشە بەردێ.

٢ـ کۆتەرە

رووبارێکی توندوتیژی سەربەرەو خوار
لرفەی دەهات
کۆتەرەیەك بە سەریەوە . .
نەیدەزانی بۆ کوێی دەبات
گێژاوێ ویستی لوولی دات
هاواری کرد
بۆدارستانی بەرنەوە، هەرداری مرد . .

٣ـ نۆبەرە

درەختێکی تازە بەرم کەوتە بەرچاو ،
لە خۆم پرسی . . . دەشێ دەستێکی بۆبەرم؟
بۆ نۆبەرە دەنکێکی‌لێ بکەمەوە؟!
هەموو رۆژێ‌لە باخەڵما بۆنی بکەم بەخەمەوە؟
ـ ئەگەر ناخت هاتە کوڵ و وتی ئادەی
حەڵاڵت بێ؟
حەزە . . پرسیاری دەروونە
چۆن وەڵامی نەدەمەوە؟!

٤ـ قەڵەمی شەل

هەرچەند ئەندێشەم سەردەکا . .
قەڵەم دەگرم بەدەستەوە
هەرچی پەیڤی رێك و پێکە دەیانهێنم
تابییانکەم بەداوی کرژی هەستەوە
ترسێ دەروونم تەی‌دەکا
هۆشم دەخاتە پێ‌مەلە
وەختێ بەخۆما دێمەوە . .
خەیاڵ خاوە، قەڵەم شەلە .

٥ـ چاوی شار

باران . . باران ، بۆ دەبارێ؟
بۆخۆش ناکاو دێتە خوارێ؟!
مزمەعیل بێ چاوی شارێ
نە بارانی پەڵەو چلەو نەبای بەهێزی
داراوس دەیهەژێنێ!
کەچی گڤەی رەشەبایەك
تۆزی چەوری بەسەراکات
خامۆش دەبێ و دەیخەوێنێ .

٦ـ نەریت

نەریت وایە . .
تۆ ـ رۆڵە ـ بی‌و منیش ـ مامە ـ
لەگەڵ هەموو مامەیەکتا نەفسم لەنوێ
دەکولێتەوە کۆنە زامە .
چی روودەدات؟ ئەگەر نەریت ،
لەژێرپێما دابنێم و بەرز بمەوە؟
دەمم بگاتە خاڵانت .
دەستم بگاتە باخەکەی ژێر باڵانت .
لە باڵاتا خۆم نوقم کەم
بچمە ناو رۆژو ساڵانت؟! .

٧ـ «یاغنیش»

بەشەوم وت : چاو لێك مەنێ
ئەمشەو ، دەڵێن شەوی قەدرە .
ئەستێرەی لەیل و مەجنوونیش دەگەن بەیەك
پۆل پۆل فریشتەی باڵ چەرموو دەنیشنەوە
لەگوێ رووبارو سەرچاوە! ،
ئاسمان گەرای راموسانی ،
لەسەر لێوی عەردی دەنێ
وتی : من هەر بەخەبەرم جێ ژوانی
دڵدارانم
وتم : کەواتە یاغنیشم بێ خەبەرم
هیچ نازانم .

٨ـ هەتوان

بەیانی‌دا ، هەڵسام لەخەو
دەرگام داخست لەقەپی شەو
بەکاواندا بەرەو ئاسۆ هەڵزنام و
شیعرێ بەری ئەم ژانە بوو
دەستم شکێ ، نەلە ئامێزی خۆم گرت و
نەنامم نا ،
نەوەك هەتوانی مێوو رۆن لە زامم نا .
نەوەك چێژێ لە بەرکوڵێ ، لە زارم نا! .

# چاوی فرۆکه

محمد امین پێنجوێنی

هەور لە خوارمانەوە
کلووە لۆکەی هەللاجی کراوە
خوری شی کراوەی بەر شەیە
بەفرە بولکەی بامالی لووسە
سایەقە هێلەساوی داوە . . !
یا . . شەمال دا نار داناری کردبێ
گەردوون ئەڵێی کفنی لەخۆی هەڵکێشاوە
لە پێیـــنەوە فرۆکەی نزمتر
یا(کۆنکوردی)بەلاتا گوزەرکەر
وەك نەهەنگی شینە
کەلە دەریای شیر بپژمێ . . !

**

ئای سوفی‌یە خان
بەفرمێسکی تۆ
ژەنگی یادگارەکانم ئەسرم
بەهەناسەی شەوبۆت
ماندوویی جوانەمەرگیم!
زیندە بەچاڵ ئەکەم
گوخرەکانی مەم
شیلانە ئاڵەکەی ناو مێخەك بەنی دایکم
وەبیر دەخاتەوە!
مەزەی هەڵمژینی لیۆت
تامی مزری ریواسی (کەلیخان)[1] ە

**

هەورەکان بەیەکدا دەچن
چەشنی دێو، تەلیسم، ئەنرکێنن
وەکو من و تۆش تاوێزان دەبن
ئەوان با پەرەوازەیان دەکا
ئێمەش چارەنووس
دەریا ئاسمانێکی ترە . .
هەتا چاو ئەیگرێ شیر دەکاتەوە
گەمی‌یەکان وەکو ئەستێرەن
کە بەمەلە ئەکشێن
شەپۆلی کەفجەرێن . .
کە شەپلاخە لەکەنار دەدا
نەیزەکی ئاسمانی ئەرزە!
ئێمە لە بەینی دوو ئاسمانا دەفرین . . !!

**

لووتکەی کێوەکان
هەندێ کەسکە هەندێ بەفری سەر پۆشە
چەشنی جەنگەلستان قنج بوونەتەوە
لێرەواری شاخ
لەبەرزایی‌یەوە
لەدارستانی کاژ سامناك و جوانترە . . !
شارەکان بەشەوە زەنگی
چراخان ئەکەنە گەردانە!
وەکو کچە قو لەکانی ئەفریقان
کە مرواری لەمل ئەکەن!
ریگا رەشماری شڵەو بڵەیە . .
لە قەدی چیا ئالاوە . . !
ماشینەکان خاڵ خالۆکەی بێ باڵن . . !
وەکو کیسەڵ ئەخزێن
شەمەندەفەر کولەکوێرەیە!
دووکەڵەکەی هەناسەیەتی . . !

**

ئیستا زانیم کەجوانی لە شیعر گرانترە!
تۆ جوانیت هەیە منیش هۆزان

**

بە تاسوقەوەم چ زوو بنیشینەوە
تابکەوینە مەلەی گومە شیری‌بەکە
لەناو بەلەمی ئارەزوو مانا
سەولی حەز لێ بدەین هەتا خامۆشین
باسنارەی بسکی نگرۆت
راوی ماسی‌یە سوورکە بکەین
وەکو پیرەی هەمەنگوای
نەهەنگی نگین راکێشین!

**

خۆزیا دەبووینە دوو پەری سپی
لەو پەڵە هەورە زەرد یاوەدا
کەژاوەیەکمان دەکردە هێلانە!!
پەلکە زێرینەمان دەکردە دەسرازە!
خۆمان پێکرا شەتەك دەدا . . . !

**

ئای سوفی‌یەخان
چاوەکانت دوو ئەڵماسی سەوزی
داگیرساون . .
جووتە مۆمی شەوی زاوایم
دێنێتەوە یاد!!
مەمکەکانت پێکی دەم پلن!
بە ئەندێشە ئەمکەنە شای پەریان
ترۆپك بە ترۆپك ئەفرم
هەتا پۆپەی کەژکەژان
کەقورسایی سەری زەرکەم
ئەنێمەسەر نەماریی مەم
جوانەمەرگیم ئەبوژێتەوە
ژەنگار ستانی گیان زاخاو ئەدەنەوە
کەرووی هۆش و نەریت ئەتاشن . . !
بۆیەوا شەوارەو کەنەفتم
وەکو ماسی ژەهر چەشتەم
هەرچی‌خرۆکەی سوورو سپیم هەیە
بەکوورەی ئەشقی ئەم شەوت
ئەتوێتەوە
. . ئەت . . وێ . . تەوە

**پەراوێز**

١ـ کەلیخان :ـ شاخێکە نزیك پێنجوین
٢ـ زەرکەم :ـزەرکەتالە کالەکی نەگەییوە
٣ـ بیـــرۆکـــەی ئەم شیعـــرە لە بەرزایی چل هەزار پێ‌وە لەنـــاو فرۆکەدا دروست بووە ، لەگە شتێکما بۆ ئەورووپا

شیعر

# لەشت بۆنی ئەم خاکەی لێدێ.

لەتیف هەڵمەت

لەشت بۆنی خاك و خۆڵی
ئەم نیشتمانەی لێ دێ
وشەی منیش بۆنی عەشقی تۆی
لێ دەپژێ

* *

پرچت بۆنی هەتاوی وڵاتەکەمی لێدێ
ناو لەپی منیش بۆنی عەتری
لەشی کچۆڵە دەستە مۆکانی لێ دەبارێ

* *

من دەزانم دەمی کچان
شانەی هەنگوین نیە
بەڵام دانی پیادا ئەنێم ئەگەر ماچی ناودەمی کچانم نەچەشتایە
هۆنراوەکانم وا شیرین نەدەبوون . .

* *

رەنگە ناونیشانی هەندێ شیعری خۆم
لەیاد بچێ
بەڵام هەرگیز ناوی ئەو نازدارانە ناپرووکێنم
کە گوڵی ئاگر لە لەشیان دەدزم . . !

* *

من شاعیرێکی سەیرم
هەندێ جار سۆفی‌یەکی گەورەم و
لەسەرانسەری گەردووندا
لەنووری خوا بەولاوە
هیچ شتێکی دی بەدی ناکەم
جاری واش هەیە



یادمــه دیــده تاویٚ به خاکــه‌کــه‌ی به‌رپــێتــا گه‌را شوێــن
هه‌نگاوه‌کانت ده‌هاتنه چاومه‌وه!
سه‌رم به چ گرانی‌یه‌که‌وه هه‌ڵێنا، هه‌ر مه‌پرسه:
سه‌رنجی سه‌وزو زه‌رد بوونــه ئاشقــه‌و ماشقــه! به‌زمـانی چاو یارمه‌تیم لیٚ خواستی و دوو تاڵی که‌سکم له‌و روانینانه کرده‌وه تا بیکه‌مه پشتێنی ئه‌وینی شاری کورده‌وای!

**هه‌وه‌ڵ لاپه‌ره‌ی ژووانمان چۆن هه‌ڵدایه‌وه؟**
**کیٚ زووتر هه‌نگاوی جیایی نا؟**
**ئاخۆ شه‌رم پیتی له لێومان داماڵی؟**
**ئه‌ی ناسیاوی تۆ ده‌رکه‌وت؟**
**ئه‌و هاوه‌ڵه زوڵانه‌ی من بۆ تاڵی به‌چوار په‌لیش ده‌یانروانی؟**
**نازانــم، بیــرم نه‌مــاوه، چۆن بمــێنــنیٚ، ئاخــر ژووره مه‌خمه‌ری‌یه‌کانی یادیش به‌ر تالاَن که‌وتن!..**
**چه‌نـد رۆژو هه‌فتـه‌ی خایـاند جا قه‌ڵه‌م د نووکی ئاڵی نایه ناو په‌ری سپی جوانیته‌وه؟**

پاشی چه‌ندین کوژانه‌وه‌و کاغه‌ز درین پیت که‌وته باڵه فڕیٚ و به چاوتــه‌وه نیشتــه‌وه. ؟ قه‌ڵه‌م گه‌لیٚ وێنه‌ی جوانی بۆ که‌ویٚ کراو بیــرم نه‌مـاون. بڵێی له تووربێنی بیستنمـا چپـه سووره‌کانت مابن، هه‌روا بۆیان ده‌گه‌رێم، به‌ڵام موخابین:
ده‌نـگـی زڕو کاسکــه‌ر ته‌نگیــان پیٚ هــه‌ڵ چنین، گه‌ر گویٚ نخــوون که‌مــه‌وه ده‌یـان کاسێتی ره‌ش پر ده‌کـاتــه‌وه. لاپه‌ره‌ی ته‌ماشا هێنده به زی دیمه‌نه تاڵه‌کانه‌وه کرا پێم سه‌یره کوێرایی دانه‌هاتووه!
بۆم بلوایــه ئه‌و سروه‌یــه‌م ده‌دیتــه‌وه چپــه‌ی ئاڵی تۆی پیٚ‌یـه له‌سینـه‌م دا ده‌مـڕوانـد تا هه‌نـاسـه‌م بۆنی ئه‌وێنتی به‌سه‌ر دڵی خه‌مینی دنیایه دا به‌شیبایه‌وه..

*

**له کویٚی، له کویٚی؟**
**له کام هه‌وار بیٚ‌نازی کۆ ده‌که‌یه‌وه؟**
**نامـه باڵـداره‌کـانت ساڵی چه‌نـد جاریٚ ده‌ملاوێننه‌وه. ساکه ده‌شتی گیانم داده‌گرن..**
**به هه‌مــان تاســه‌ی دوو سه‌دو چل مانــگه له‌مــه‌و به‌ره‌وه،**
**ده‌یانخوێنمه‌وه‌و**
**ده‌مخوێننه‌وه!**

گویٚیان بۆ راده‌دێرم، ناوم ناون که‌ژه گوڵره‌نگه‌که‌ی نه‌سه‌خانیٚ!
گه‌لیٚ شارو ولاَتم بردوون و هێنــاومنــه‌وه، ئه‌و به‌رامــه‌یــه‌ی ئاورشێنی نامـه‌کـانت پیٚ کردوون هه‌روا بۆنیان خۆشه‌و به‌و باڵه ته‌نکانه‌یانه‌وه به‌سینه‌م دا راده‌بوورن و ناو ناوه به بۆنم ده‌خه‌ن.
ده‌بیٚ عه‌تر هه‌بیٚ حه‌وت هه‌زار رۆژ بژی؟ ئه‌ی ئه‌وه نی‌یه!

*

تۆ بڵێی تازه‌کانیٚ که‌سێکی دیکه‌م وا بێته‌وه به‌ر چاوو خۆشم بویٚ؟
مه‌گه ئه‌وینت پیٚ هێشتم؟
له‌وســاوه ئه‌وانــه‌ی میــوانــی دڵــمــن یان بچــوك بوون و پێم نه‌زانیون، یاخود له به‌ر گه‌وره‌یی‌یان به‌دڵمه‌وه نه‌چوون. بۆ هه‌ردوولا بوومه سه‌یرانکارو چی که نا!

*

له دوا نامــه‌دا ئه‌و، بانگـه‌ت به گویٚ‌دا دام «حــه‌ز ده‌کـه‌م ناوم بهێنی» بریا ناوی که‌سم نه‌هێنابایه تۆ نه‌بیٚ.. چ بانگه‌وازێکی مژده هێن و تاســه‌شکێن.. ده‌تــوت ئه‌ستێــره هاتوونه خواریٚ و له‌نـاو دڵـمـا سه‌مـای تیشـك و ژووانی په‌ری‌یـان ده‌به‌ستن..
خشته کاڵه‌کانی گه‌ره‌ك له‌ناو دیوارانه‌وه قریوه‌یان ده‌هات..
چاو به کوێـری نه‌بـایه ده‌بوونیگای تۆی لیٚ نه‌وه‌ریٚ.. دڵ مه‌گه به وه‌ستان ده‌نا خورپه‌ی تۆی هه‌ر پیٚ ده‌مێنیٚ.

*

ئه‌و هه‌وره کاڵانــه‌ی به ده‌م بای ئێـوارانــه‌وه ده‌ســرۆکــه‌ی ئه‌رخــه‌وانــی‌یــان بۆ ده‌هــاویــشــتــم منیش بیٚ پرس،دڵم بۆ ده‌گرتنه‌وه..
کیوٚه چوون؟
هه‌روابه‌وشه‌کانتا ده‌چمه‌وه، نامه‌کان تویٚ تویٚ هه‌ڵ ده‌ده‌مه‌وه...
. ده‌بنه بارانێکی به خوڕم و بۆ خاکه تینووه‌کان ده‌بـارێم، گوڵـه ئه‌وینی تۆ چوار که‌نـاری دنیـایه داده‌گریٚ..
په‌لکــه گوڵ له‌پــه‌نجــه‌ره‌ی ماڵانــه‌وه ده‌خـزێتـه دڵی ئاشقـه رووته‌کانی دنیایه! تا یادیان به بۆن خا!

# گوڵبارانی خەمناکی

جەزا عەلی ئەمین    تشرینی یەکەمی ١٩٨٨    کەرکوک

ئای لەو کاتە گوڵدارە:
سەرلەبەیانی ، دوا نیوەڕۆ یا دەمە دەمی ئێواری بوو؟
چ جۆرە پەیڤێکی دووراودوور کام جوولانی پەنجەی ناوقڕ بوونە زمانی درکاندنێ؟
بریا بیرم دەما!
ئاخۆ سەرنج ڕێی نێوانی چۆن بری بێ؟ چەندین جار بەدەم باڵەتەپەوە کەوتووەو پاشان بە بان چڵە ئاڵەکانی جوانیتەوە نیشتۆتەوە تا هەلاڵەی شەنگیت بگرێ.. ؟ پێ لەو دەمەدا ڕێی نێوانمانی لێکدەدا هەنگاوی لە خۆ دادەماڵی یان نا؟
ئەو دەمی خرکە بەردی کۆلانێ لە پێم دەدراو نەمدەدی یاخو بە لۆکەم دەزانین..! ئەو هەموو نیگا تیژانەی ئەم و ئەودەرزی ئاسا تێیان دەگرتین کەچی بە پەلکە گوڵمان دەچواند!
ئەو چرکە سرکانە، سینەو هەناسە، دڵ و خورپە، چاوو تررووکە چۆن ژیان؟

*

**ئەری کێهەمان پەنجەمان زووتر ڕاکێشا، دەبێ ئەو قامکە ترساوییانە ئەو دەستە شەرمنە بە بارتەقای چەند چیای خەمناك قورس بووبێ؟ ئای تەریقی!**
**بیرمە دەتوت دووپەیکەرین و لە چاوترووکانێکا دەبینە هەزاران پارچە.. بەڵام لێك نەدەبووینەوە..**
**ئەو دەمی شەرم و شکۆ دەباری!**

ئەو دڵۆپە ئارەقانەی بێپرس ڕژانە سەر دەشتی لەش نەدەبژێردران، بریاو سەد بریا بۆ ئێمرۆم دەهێشتنەوە تا ئەو دڵۆپە ئاونگە پاکانەی شەنگیتم دڵۆپ دڵۆپ بخواردایەتەوە، جا مەست بام و بە دەرزی ئاژنینی پەستیم نەزانیبایە. ئاخۆ کاممان یەکەم پێکی بزەمان بە رووی یەك دا پژاند؟ ئەو پەیڤەی ئەوینی درکاند چۆن لێوی نەڕنی؟ نیگات بە چ سیحرێکەوە وەکی ڕشێنە باران ڕژایە هۆبەی بینینەوە.. لە

یادمــە دیــدە تاوێ بە خاکــەکــەی بەرپــێتــا گەڕا شوێــن هەنگاوەکانت دەهاتنە چاومەوە!
سەرم بە چ گرانی‌یەکەوە هەڵێنا، هەر مەپرسە:
سەرنجی سەوزو زەرد بوونــە ئاشقــەو ماشقــە! بەزمـانی چاو یارمەتیم لێ خواستی و دوو تاڵی کەسکم لەو ڕوانینانە کردەوە تا بیکەمە پشتێنی ئەوینی شاری کوردەوای!

**هەوڵ لاپەڕەی ژووانمان چۆن هەڵدایەوە؟**
**کێ زووتر هەنگاوی جیایی نا؟**
**ئاخۆ شەرم پیتی لە لێومان داماڵی؟**
**ئەی ناسیاوی تۆ دەرکەوت؟**
**ئەو هاوەڵە زۆڵانەی من بۆ ناڵی‌بەچوار پەلیش دەیانڕوانی؟**
**نازانــم، بیــرم نەمــاوە، چۆن بمــێنــێ، ئاخــر ژوورە مەخمەری‌یەکانی یادیش بەر تالان کەوتن!..**
**چەنـد ڕۆژو هەفتــەی خایــاند جا قەڵەم د نووکی ئاڵی نایە ناو پەڕی سپی جوانیتەوە؟**

پاشی چەندین کوژانەوەو کاغەز دڕین پیت کەوتە باڵە فڕێ و بە چاوتــەوە نیشتــەوە.؟ قەڵەم گەلێ وێنەی جوانی بۆ کەوی کراو بیـرم نەمـاون. بلێی لە توورەبێنی بیستنمـا چپــە سوورەکانت مابن، هەروا بۆیان دەگەڕێم، بەڵام موخابین:
دەنـگــی زڕو کاسکــەر تەنگیــان پێ هــەڵ چنین، گەر گوێ نخـوون کەمــەوە دەیــان کاسێتی ڕەش پڕ دەکــاتــەوە. لاپەڕەی تەماشا هێندە بە زی دیمەنە تاڵەکانەوە کرا پێم سەیرە کوێرایی دانەهاتووە!
بۆم بلوایــە ئەو سروەیــەم دەدیتــەوە چپــەی ئاڵی تۆی پێ‌یــە لەسینـەم دا دەمـڕوانـد تا هەنـاسـەم بۆنی ئەوێنتی بەسەر دڵی خەمینی دنیایە دا بەشیبایەوە..

*

**لە کوێی، لە کوێی؟**
**لە کام هەوار بێ‌نازی کۆ دەکەیەوە؟**
**نامـە باڵـدارەکـانت ساڵی چەنـد جارێ دەملاوێننەوە. ساکە دەشتی گیانم دادەگرن..**
**بە هەمــان تاســەی دوو سەدو چل مانــگە لەمــەوبــەرەوە،**
**دەیانخوێنمەوەو**
**دەمخوێننەوە!**

گوێیان بۆ ڕادەدێرم، ناوم ناون کەژە گوڵڕەنگەکەی نەسەخانێ!
گەلێ شاروولاتم بردوون و هێنـاومنــەوە، ئەوبەرامــەیــەی ئاورشێنی نامـەکـانت پێ کردوون هەروا بۆنیان خۆشەو بەو باڵە تەنکانەیانەوە بەسینەم دا ڕادەبوورن و ناو ناوە بە بۆنم دەخەن.
دەبێ عەتر هەبێ حەوت هەزار ڕۆژ بژی؟ ئەی ئەوە نی‌یە!

*

تۆ بلێی تازەکانێ کەسێکی دیکەم وا بێتەوە بەر چاوو خۆشم بوێ؟
مەگە ئەوینت پێ هێشتم؟
لەوســاوە ئەوانــەی میــوانــی دڵــمــن یان بچــوك بوون و پێم نەزانیون، یاخود لە بەر گەورەیی‌یان بەدڵمەوە نەچوون. بۆ هەردوولا بوومە سەیرانکارو چی کە نا!

*

لە دوا نامــەدا ئەو، بانگــەت بە گوێدا دام «حــەز دەکــەم ناوم بهێنی» بریا ناوی کەسم نەهێنابایە تۆ نەبێ.. چ بانگەوازێکی مژدە هێن و تاسـەشکێن.. دەتـوت ئەستێـرە هاتوونە خوارێ و لەنـاو دڵـمـا سەمـای تیشـك و ژووانی پەرییـان دەبەستن..
خشتە کاڵەکانی گەرەك لەناو دیوارانەوە قریوەیان دەهات..
چاو بە کوێـری نەبـایە دەبوو نیگای تۆی لێ نەوەرێ.. دڵ مەگە بە وەستان دەنا خورپەی تۆی هەر پێ دەمێنێ.

*

ئەو هەورە کاڵانــەی بە دەم بای ئێــوارانــەوە دەســڕۆکــەی ئەرخــەوانــی‌یــان بۆ دەهــاویـشــتــم منـیش بێ پرس دڵم بۆ دەگرتنەوە..
کێوە چوون؟
هەروابەوشەکانتا دەچمەوە، نامەکان توێ توێ هەڵ دەدەمەوە.
. دەبنە بارانێکی بە خوڕەم و بۆ خاکە تینووەکان دەبـارێم، گوڵـە ئەوینی تۆ چوار کەنـاری دنیـایە دادەگرێ..
پەلکــە گوڵ لەپــەنجــەرەی ماڵانــەوە دەخـزێتـە دڵی ئاشقـە رووتەکانی دنیایە! تا یادیان بە بۆن خا!

• شیعر

# پەلە..!

شیعری مکرم ڕشید تاڵەبانی

تەنیا..
دیوارەکان تێت دەڕوانن،
هەراسانی..
پەژارەی شەوورۆژی ژیێتە،
مەرگی کاتە..
پێکەنینتە!!
هەناسەو تاسەو ئەشکی کوڵ
چاوەڕوانن،
گەردانەی گەردنی زەردی..
وێنەکانن!!
کەتێوارەی خەفەت دادێت دا
ژان و ئێشە
لەدەرروون و لە بەرماڵی وورياييت
هەڵ دەپەڕێت!!
ئامێز بۆ دووکەڵی خەوون
دەکەیتەوە!!
چینینی تەوون
بزمارێکی یادگاری بێ هاوەڵە
لەرێشەی هۆشت گیر دەبێت
خوێنی فرمێسك
ڕووباری چاو
دادەچێنێت !!
هەتاو
پەلە هەورێکی بەر ڕەشەبای وەرزە
تەرزە
ڕاگیر ناکات!
بیری پەپوولەکان
ژەمی هەموو دەمی خەونەکانتە
لەگەڵ بیرەکان دا
لێك دەئاڵێت
ئامەزرۆیی گر دەگرێت و
هەناوی ناز گورج دەسووتێت
پەنا بەر ڕێ دەبەیت،
بەدیواری بیردا
خوت و گوچانە لەرزۆکەکەت
هەڵ دەسپێریت!!
سروودەکان ڕووت تێ ناکەن
شەماڵەکان
گوڵاڵەی دەم بەیانیانت،
بۆڕاناخەن!!
چاوە گەشەکانت
بۆ پێ ناکەن!!
ـ کەی ئەم نشیوە.. هەورازە تەتۆراوە
تەخت دەکەیت؟!
کەی ئەم ئەستێرە
دوور خراوە
چنگە خۆ دەخەیت؟!
کەی ئەو ملوانکە نەپچراوە
لەگەردنی ئاسکوڵ دەکەیت؟!
کەی پرشنگی بۆچاو دەبەیت
سێبەر.. توور دەدەیت و؟!
ناهەمواری لەدار دەدەیت؟!
ئەم هەناسەی تۆی بەئاگا
بۆچی برناکاتە دیوی دوز تی کەوتووی
دڵ شەق بردووی
هەناوەکان!!
تاکەی چاوی پەشیمانی
لە دوو ڕیانی
پەژارەدا

دێنیته گل؟!
بۆچی تاوێری زل
لەبەر قاچی تەمەنت دا
ناخەینە پل؟!
- تۆ گەلای قەد ئەو باڵایەت
داگەراوە
ژووری هەستت
تێك خنكاوە
یەك خرۆكی سوورو سپی ی
تیا نەماوە!!
دە هەڵسە دەی..
لەوێ تاكەی..
بەدەستی زورنای گۆپاڵەوە
چەپلەی بێ دەنگ
بۆ دەروونی ناخ لێ دەدەیت
تاكەی هانات
بۆشمشماڵی بێ ئاوازی
دەبەنگ دەبەیت!
ئەو گەردنە.. تێ پەڕینە
تیپە بێ دەنگەكان
بتاسێنە
شەو مۆتەكەی پەشیمانی
دروست دەكات
باسەرمای دڵ
جەستەی خوێنی ووشەكانت
نەمەیەنێت!!
سواری پشتی ئەسپی «گل» بەو
بەدەروازەی بارانێك دا
تێ ی تەقێنە
لەپێ دەشتی وورووژان دا
پەلە بدەو
سوێسك وكەوو
كوركورەكان
گشت رابێنە!!

# یاری مووشێن

نوری كاكە حمە

مێژووی رێكخستنی ئەم هۆنراوەی (مووشین)ە ئەگەڕێتەوە بۆ پێش(٤٠)ســاڵ وە ئەم وشانــە لەبـەر ئەوەی لە فەوتـان ولە ناوچوندایە وام بە باش زانی كە بڵاوی بكەمەوە چونكە لە دەور وبەری سەد ساڵ لەمەو پێش لە سلێمانی لەیاری مووشیندا بە كار هێنراوە تا ئەم دوایی یە

ئەندازیار نوری كاكە حمە

**یاری مووشێن**

**كورگەڵ لەسەرشار كانی مووشێنە**
**میچو هەڵماتت لە كیس دەرهێنە**

میچ بە (میر)دانێ نەك بە جەکو پشت
بۆ بەگی تیل کەن کورگەلینە گشت

(بەگ)کە تیلی کرد پەنا حەجی گرت
بە هەڵ گرتەیی پاش بەگ (قرچی)گرت

خلەی پیلکەخوا رخۆ مووشێکی خوارد
(قرە)ش خشکەیی تیلێکی بۆ نارد

من کایەی خۆمە بەس یاری ناکەم
نەك کۆستە کۆستەو لێم بکەن دیشکەم

میچی ناوکویی بە شێرو خەتە
گزی کەر میچی کەم بەرەکەتە

(حەپولکە)تیلی بە فێڵ و خوارە
لە سەری ناکەین ئیتر ئەمجارە

فس بە سەریاکە بە تسی ئاتێ
پیلکەی خوار ئەبێ تیلی ناگاتێ

پیلکە راست وەستای ناو هەڵماتێنە
مووشێنو تیلی بەرامبەرێنە

هەڵماتی خاڵدار هیشتا گلۆرە
با بیسوینەوە هەردو بە نۆرە

(دەست کەلام هەڵگرت لام دا لە مووشێن
تاکو کایەیە گوێز کەم بە (واغێن)

کە دیم چاڵ چاڵێن کۆری گیراوە
کە تاق بۆی دۆرا جوت بۆی داناوە

وەستا بە (حلێب)بۆی کردم بەماڵ
دوو هەنگاو لە دوور جوتم خستە چاڵ

دیم (وسوی)برام هاتووە بە دووما
کەوتمە (هەڵمەقۆ)خۆم لەگەڵ خۆما

باوکم لە مزگەوت هاتۆ ، بەرەوماڵ
تیم تەقاند منیش خێرا وەك شەماڵ

ترسام کزۆڵە چومە پشت دایە
نەخۆشم گوایەو کورِ لە جێدایە

شەرتبێ ئەم داخەی باوکم برێژم
بە (قۆچەقانی)خەلقی بگوژم

بۆ چیمە مەکتب خاوەند کوتەکم
ئازاوو چەتون وگەورەی گەرەکم

لە شەرەگەرەك سەر باش ئەشکێنم
بێ حەیای شارم هەڵمات ئەفرێنم

میر: دانانی میچ لەسەرشان بەڵام لەسەرپانی پێی ئەلێن جەك وپشت

هەڵ گرتەیی: تیل کردن بە هەڵمات بە بەرزی وە

خشکەیی: تیل کردن بە هەڵمات لەسەر ئەرزەکە
بەگ: یەکەم کەسە کەتیل ئەکات

قرە: دوا کەسێکەکە تیل ئەکا

کایە: نۆبە

کۆستە کۆستە: یاری تێکدان

دیشکم: یاری تێکدان

میچی ناوکویی: ئەومیچەی لە شەراکەتدا بەشی ناکرێت

حەپولك: تیل کردن بە فێڵ و بە هەڵە

گلور: هەڵمات هێشتا بە تەواوی ساف نەکراوە

# من لەنێوان هێمنی تۆو هەڵچوونم دا

شیعری لیازی حەمە عزیز



هاتنی تۆ؛
شنەی حەزێکی شیرین و
ئاوازی بەستەی ناخمە
دیداری تۆ
تەڵقینی مردنی خەم و
ژان و پەژارەو ئاخمە
نازدارەکە . .
من لە نێوان هێمنی تۆو هەڵچوونم دا
سەرم گەرمە
سەرم گری ناخی خۆم و
ساوای کۆشی
چاوانی تۆی پڕ لە شەرمە

* *

لەیادمە کە دەهاتی
شەبنمێك بووی . . مژدەی گزنگت دەهێنا
شەماڵێك بووی
لەخوار گەردنی خاچەوە .
زرینگەی زەنگت دەهێنا
ئێستاش لەجیاتی گزنگ و
زرینگەی زەنگی بەیانیت
دەریایەکی شین و مەنگی
کەروێشکە دەکا شەپۆلی
هێمنی شەنگیو جوانیت . .

* *

ئەوا هاتی
لە هاتنتا، هەستم دەبێتە دەریایەك
فڕی لێ دێت و
کەشتی نیگا گەرمەکانت هەڵدەلوشێ
لە هاتنتا ؛
دڵ دەبێتە هەناوی پڕ لە گەردەشی
ئەو شەقامەی
پێکی ڕەوتەکەت دەنۆشێ

* *

# جامی و مەرعان

هێڤین گابیرکی



خویندەڤانێ هێژا . . .
دگوتنا ڤێ بەیتێ دا دیاردبیت کو یا هاتی یە رویدان ل کوردستانێ ل دڤەرا گەردی و شێروانیا ل ناڤبەرا مالەکا ئێک خوینێ ئەوژ ی ژ گوتنا بەیتێ دیاترە کو ئاغاو پس ئاغانە . هێژا (عبدالرحمن گابیرکی) ڤێ بەیتێ دبێژیت ب رەنگەکێ موزیقی یێ سڤك و یێ دل ڤەکی رهزر و بیرین مروڤی ژ رها دکیشیت و گوهێن مروڤی ژیڤە نابن ب ڤی رەنگی دەست پێ دکەت . . .

هێ هێ . . .
گو کولیمێ ئاڤاهی یە
موقبلێ برنج و پەمبی یە
گوهێ خو بدەنە حەکاتا
مەرعان ئاغای و جامی یە
چ سوبەیە سوبە زوی یە
مەرعان ئاغابی و رابی یە
دێ شالا رەش پێچایی یە
خەنجەرا کوسە دبەرا کری یە

قویندەر دابو سەر لنگی یە
دێ ل ماهینا خو سیار بی یە
دوازدە خولام ببەرێ کەتی یە
قەستا مالا جامی ئاغای کری یە
جامی پێشڤە دەرکەتی یە
گوتێ مەرعان ئاغا مامو
خێر بیت چ ل تە قەومی یە
گوتێ جامی مامو تو دزانی
بسەر مەدا هات سالەکا گرانی یە

چ بەرو بێدەر بو مەنەهاتی‌یە
عەیالێ من دخانیڤەی برسی‌یە
نێ تە میستەت ب ئاڤێ نی‌یە
تو ئاڤێ ب دەم ب هەدی‌یە
دا ئاڤێ بیەمە چەمی یە
ل بەر بکەم برنجی‌و پەمبی‌یە
گوتێ مەرعان مامو
من ئاڤ داتە ب هەدی‌یە
تو ئاڤێ ببەو چەمی‌یە
ل بەر بکە برنج و پەمبی‌یە
مەرعان ئاغای بخو
گەلەك میننەت ژێ گرتی‌یە
قەستا مالا خو کری‌یە
,وێ شەڤێ نە نڤستی‌یە
پالە بخو درست کری‌یە
سکرێ کولێمێ گرتی‌یە
دێ چویا برە چەمی یە
ل بەر کرن برنج و پەمبی‌یە
چەند هەیامەك پێ چویی‌یە
دێ جامی ئاغایێ‌و رابی‌یە
دێ شالاّ رەش پێچایی‌یە
خەنجەرا کوسە دبە . راکری‌یە
قویندەر دابو سەر لنگی‌یە
قەستا مالاّ مەرعان ئاغای کریە
مەرعان ئاغا پێشڤە هاتی‌یە
مەرعان ئاغا ژێ شەرم کری‌یە
گوتێ جامی مامو هەرە
من تو کری‌یە ئاغایێ گەردی شێروانی‌یە
جامی بخو میننەت ژێ کرتی‌یە
قەستا مالا خو کریە
چەند هەیامەك پێ چویی‌یە
مەرعان ئاغایێ‌و رابی‌یە
ما شالاّ رەش پێچایی‌یە
خەنجەرا کوسە دبەرا کری‌یە
قویندەر دابو سەر لنگی‌یە
دێ ل ما هینا خو سیاربی‌یە

دوازدە خولام ببەرێ کەتی‌یە
قەستا مالا جامی ئاغا کری‌یە
نێ جامی ئاغایێ ل مال نی‌یە
یێ چوی دگەرییێت ناڤ میللەتی‌یە
دێ ماهینا خو زڤراندی‌یە
عەیشەلاوێ سەرێ خو
دپەنجەرێ دەر ئیخستی‌یە
گوتێ‌ما هەما جامی ل مال نی‌یە
خو مال دگەل خو نەبری‌یە
کەرەمکە روینە قەهوەکێ ڤەخو
بخێر هاتی سەر سەری سەر چاڤی‌یە
مەرعان ئاغایێ پەیابی‌یە
ل دەڤ عەیشە لاوێ روینشتی‌یە
قەهوەکا ڤەخاری‌یە
جگارەکا ژکیسکێ خو تێکری‌یە
ڤراڤینەکا ل دەڤ عەیشە
لاوێ خاری‌یە
زڤری قەستا مال کری‌یە
جامی ئاغایێ زڤری‌یە
بینا فەسادا ل عەردێ خودێ نەهاتی‌یە
بو جامی کرە چکی‌و فەسادی‌یە
گو جامی مامو تو ئاغایەکێ گرانی
تو ب ڤێ مەسئەلێ بزانی
مەرعان ئاغا حەش عەیشە لاوا
ژن بابا تە دکەتن ب تمامی‌یە
کەربێت جامی ئاغای ڤەبی‌یە
دێ شالا رەش پێچایی‌یە
خەنجەرا کوسە دبەرا کری‌یە
قویندەر دابو سەر لنگی‌یە
قەستا سکرێ کولێمێ کری‌یە
دێ پێنەك ل سکری دایی‌یە
ماسکرێ‌ژبنی بری‌یە
کەراخێ ب دی ئاڤێ هەلهاتی‌یە
دیت جامی ل سەر سکری رونشتی‌یە
کەسێ‌قووەتا جامی ئاغای نی‌یە
جاب بو مەرعان ئاغا بری‌یە

مەرعان ئاغا مامو تو بزانی‌یە
ما جامی ئاغایێ هاتی‌یە
پێسنەکا ل سکری دایی‌یە
دێ سکرێ ژبنی بری یە
مائاڤ ناچیتە چەمی‌یە
برنجی گولیا نخاندی پەمبی
رویشیك بەردانە عەردی‌یە
مەرعان ئاغای لەزاندی‌یە
سەر کول و پێخاس
قەستا سەر سکری کری یە
گوتێ‌جامی مامو تو دزانی‌یە
مابەینا مەو وە پسمامینی‌یە
یا بسەرمەدا هاتی سالەکا گرانی‌یە
چ بەرو بێدەر بو من نەهاتی‌یە
ئو تە میسنەت ب ئاڤێ نی‌یە
تو ئاڤێ ب دەمن ب هەدی‌یە
دا ئاڤێ ببەمەڤ چەمی‌یە
دلێ جامی ئاغای پێ سوتی‌یە
سکرێ کولێمێ گرتی‌یە
ما ئاڤا برە چەمی‌یە
چەند هەیامەك پێ چویی‌یە
مەرعان ئاغایێ رابی‌یە
قەستا مالاّ جامی ئاغای کری‌یە
دێ جامی ئاغایێ ل مال نی‌یە
عەیشە لاوێ سەرێ
خو دپەنجەرێ دەر ئیخستی‌یە
گوتێ مەرعان ئاغا مامو
ماهەما جامی ئاغا ل مال نی‌یە
خو مال دگەل خو نەبری‌یە
دێ کەرەمکە روینە قەهوەکێ
ڤەخو بخێر هاتی سەر سەری سەر چاڤی‌یە
مەرعان ل دەڤ عەیشەلاوێ روینشتی‌یە
قەهوەکا ل دەڤ ڤەخاری‌یە
جگارەکا ژ کیسکی تێکری‌یە
خاترا خو ژ عەیشە لاوێ خاستی‌یە
خولاما کیسکێ‌وی لێ‌ڤەشارتی‌یە

بو جامی ئاغای کره چکیو فەسادی‌یە
گوتیٚ مەرعان ئاغا حەش عەیشەلاوا
ژن بابا تە دکەتسن بە تمامی یە
نیشاناکیسکیٚ قوتنی یە
کەربیٚت جامی ئاغای ڤەبی‌یە
دیٚ شالاٚ رەش پیٚچایی‌یە
خەنجەرا کوسە دبەرا کری‌یە
قویندەر دابو سەر لنگی‌یە
قەستا سکریٚ کولیٚمی کری‌یە
ماپیٚسنەك لەسکری دایی‌یە
دیٚ سکریٚ ژبنی بری‌یە
کەراخیٚ ب دی ئاڤی هەلهاتی‌یە
جامی ئاغاییٚ ل سەر سکری دیتی‌یە
کەسیٚ قووەتا جامی ئاغای نی‌یە
جاب بو مەرعان ئاغای بری‌یە
ماجامی ئاغاییٚ هاتی‌یە
پیٚسنەکا ل سکریٚ دایی‌یە
دیٚ سکریٚ ژبنی بری‌یە
ما ئاڤ ناچیتە چەمی‌ینە
دیٚ هشك بون برنج و پەمبی‌یە
برنجی گولیا نخاندی پەمبی
رویشیك پەردانەڤ عەردی‌یە
کەربیٚت مەرعان ئاغای زور ڤەبی‌یە
دیٚ شالاٚ رەش پیٚچایی‌یە
خەنجەرا کوسە دبەرا کری‌یە
قویندەر دابو سەر لنگی‌یە
قەستا سکریٚ کولیٚمیٚ کری‌یە
جامی ئاغاییٚ ل سەر سکری روینشتی‌یە
گوتیٚ کەروی کوریٚ کەری‌یە
دیٚ ئاڤیٚ بەمەچەمی‌یە
گوت کەروی کوریٚ کەری‌یە
تو ئاڤیٚ نابەی چەمی‌یە
توو گەردی و شیروانی هەمی
هین ئاڤی نابەنە چەمی
گوئیٚك جامی‌یە وئیٚك مەرعان
ئیٚك نیٚری‌یەو ئیٚك بەران

مائیٚك چەکوچەو ئیٚك سندان
خریٚسن ڤیٚرسا لیٚکدان
جامی ئاغای سەریٚ مەرعان ئاغای چەماندی‌یە
خەنجەرەکا ل رهیٚن قولنجا وی دایی‌یە
سەریٚ خەنجەریٚ ڤشیا حەرام
دندکەك شوٚل نە کری‌یە
مەرعان ئاغای خەنجەرەکا ل زکیٚ
جامی‌دا ریٚڤیکیٚن وی بسەر سەریٚ خوڤە هاڤیٚتی‌یە
عەلی ئاغا ژ ویٚڤە هاتی‌یە
گوتیٚ کەروی کوریٚ کەری‌یە
ماتو هەڤالیٚ جامی‌یە
گوتیٚ عەلی ئاغا مامو وەنیسنە
کوشتنا جامی ئاغای چ نیسنە
هیٚدی هیٚدی دگەل عەلی ئاغا ئاخفتی‌یە
هەتا عەلی ئاغا نیٚزیك بی‌یە
چنگل گرت و هژاندی‌یە
خەنجەرەك هاڤیٚتە ریٚڤیکیٚن وی
ئەو ژی هاڤیٚتە سەر کەلەخیٚ جامی‌یە
یوسف ئاغا ژ ویٚڤە هاتی یە
گوتیٚ کەروی کوریٚ کەری‌یە
ما تو هەڤالیٚ جامی‌یە
گوتیٚ یوسف ئاغا مامو وەنینە
گوشتنا جامی ئاغای ل نك من چ نینە
هیٚدی هیٚدی دگەل یوسف ئاغای ئاخڤتی‌یە
هەتایوسف ئاغا نیٚزیك بی‌یە
چنگل گرت و هژاندی‌یە
خەنجەرەك لیٚدا ئەو ژی
هاڤیٚتەسەر کەلەخیٚ عەلی ئاغایو جامی‌یە
بەکر ئاغا ژ ویٚڤە هاتی‌یە
گوتیٚ کەروی کوریٚ کەری‌یە
ماتو هەڤالیٚ جامی یە
گوتیٚ بەکر ئاغا مامو وەنینە
کوشتنا جامی ئاغای ل نك من چ نینە
هیٚدی هیٚدی دگەل بەکر ئاغای ئاخڤتی‌یە
هەتا بەکر ئاغا نیٚزیك بی‌یە
خەنجەرەك لیٚدا ئەو ژی هاڤیٚتە سەر

کەلەخیٚ عەلی ئاغایو یوسف ئاغایو جامی
هەوار چو بو عەیشە لاویٚ
بەژن بلندیٚ ناف تەنگ زراڤیٚ
گوتیٚ چوار ئاغا کوشتن سەرا ئاڤیٚ
هەوارا پس ئاغا بسەردا هاتی‌یە
مەرعان ئاغاییٚ رەڤی‌یە
خوٚل قەسرا کلیٚمیٚ ئاسیٚ کری‌یە
قەد تشتەك بسە، [illegible]
رەسولیٚ بابیٚ یٚ چویە ئاشی‌یە
رەسول هاتەڤە ژئاشی‌یە
گوتیٚ رەسول بابو نەچە جوتی‌یە
ما بەینا مەو پس ئاغا خوینداری‌یە
گو وەللای بابو وەنا کەم
ئینجاخا خو بیٚ ناف ناکەم
چ سوبەیە سوبە زوی‌یە
رەسولیٚ بابیٚ رابی‌یە
دوازدەنان ب لەگەنەکا
نیسکیٚ خواری‌یە
قەستا جوتیٚ خو کری‌یە
رەڤدا پس ئاغا بسەردا هاتی‌یە
گوتی کیٚرویشکا مە یاهاتی
بەرزەبی تەنەدیتی‌یە
گوت ئەزم ئەزم ئەزم
دیٚ رەسولیٚ بابیٚ ئەزم
ما کیٚرویشکا هەوە ئەزم
ئەزیٚ هاتیٚم و نابەزم
گو رەسول کوریٚ هوستایی
دیٚ چەقماقا لیٚك بادای
دیٚ چوارو پیٚنجیٚت لیٚکدایی
ماستارە نیریٚ گایی
گو رەسول کوریٚ دەرویٚشە
دیٚ چەقماقی لیٚ بگڤیٚشە
ماچوارو پیٚنجا ژیٚ بیٚخە
دیٚ رەسول کوریٚ مەرعانی
ماچەقماقا لیٚ شداندی
گو سەریٚ سەدو پیٚنجیا
پیٚکڤە ڤراندی

# ژیمان

بدل رڤومزوري

- ١- ژیمان

دبێژن :
ل پێشییێ پەیڤ بو
ستران و لاڤژەبو
هیڤیو ئامانج بو
ژیمان بو
داخازا ئێکێو دویماهیکێ بو
لێ، دبێژم :
ل پێشییێ فەندو فێل بو
نەمانا پەلاێنکا
ب هزاران بو
ژیمان، کوڤان و دەردبو
موخابن دلەیزی
لسەر گیفکەکێ
صە ژی ژبێهنا گەنی راتەقیبو.

- ٢- جارەکادی . . سیندباد

پاپوریت«سیندباد»ی
ژ کناریت خوشییێ دویرکەفتن
گەهشتنە گزیرەکێ پرە ژ ئەژدەهایێن
مروڤ کوژ . . .
گوشتێ لەشی پرت ، پرت دکرن
ولسەر پەلێت ئاگری سوردکرن
«سیندباد»بتنێ ما
ودگوت ،
هەی هو . . هەی هو
راستەگەلو:
ژیان پێلاڤەکا گەنییە
بەلێ . .
ژمێژە . . باپیرێ من بێ گوتی
روژەك دێ ئێت
ژ بیبکێت چاڤا
خەمخوریت پاپورا دێ زێن
ولدور حەفکێت رێگرا
وەریسێت پاپورا
دێ ئالینین . . .
وێ گاڤێ :
ژیان دێ بت
سترانا مانێ
سترانا مانێ

- ٣- هەژارن

ژپیلایێ جیهانێ
گوللەکا مەزن هاتە چێکرن . .
مانە راوەستیای تا هەژارێ
بئومێد ببوریتن . .
تا گولله سینگێ وی بسمیتن . .
ژ گوللێ نەترسا
بەلێ ترسا مەزن ئەوبو . .
نەکو پرتکێت وێ یارا وی بکەڤێن . .

چونکی :
دنیڤا دلی روینشتیەو
دلە یزیتن . .

—

-٤- هیڤی

ل کویراتیا دلێ پر خەم
گازیەکێ رادهێلم
تەڤ دوژمن و خوین مێژا
ب گازیا خو دێ حەلینم
ژبیر نەکەن دنیڤا گازیا مندا
چیروکا «مەم وزینێ»دێ ڤەژینم
هزرو بیریت تەڤ بەکروکا
دچمە دنیڤا وان دا تا پرتکینم
نێرگزەکێ دێ هەلینم
دپرچا خانما چیای رادچکلینم
اوازێت قەشەنگە و جوان
بو هەمی ئێخسیرو ژارا دێ گەهینم
ژبو وان چیا دێ سمینم
خوشییێ دێ هنێرم
هیڤییت وان دێ رامیسم

# وەرزی خەم

ستار احمد عبدالرحمن

خەیاڵە نیگای ئەو شۆخە
دەکاتە جێ گری هۆشم
گڕی هەناسەی ئازیزە
دەست دەخاتە بینی ڕۆژم
ئەوەندە ناخی دەروونم
گڕی سۆزی بە نێو چزا
بوومە دێوانەی سۆزی ئەو
کەوتمە بەر شەپۆلی نزا
ئەو کاتانەی شێوەی شەنگی
بەپێش دیدەم زادە بووری
خوێناو تابلۆم دەشێوێنێ
کۆتری دەستەمۆی هەستم
لە نێو دڵم ناگمێنێ
ئەدات لە باڵ . .
دوای گەواڵەی حەز دەکەوێ .
کە ماندوو بوو بۆ ساتێکی ،
لەنێو پرچی خەمی دەنوێ .
لەبەر کینەی دڵەی ڕەشی ،
پرچی زەردی لەمن دەبرێ
ناچارە مەلی تامەززۆم ،
بەرەو دەریای نامۆ بفرێ
ئۆقرە ناگرێ . .
بۆ پێش وازی دڵ دێتەوە .
لەدەست مەرگەساتی وەرزم .
بۆ لانەی خەم دەچێتەوە .



# خێڵ بەزی ژان

شیعری: عیماد عەبد لرەززاق زەنگەنە

ئەمشەو. .
ئەوینی تۆ . فریشتەکەم
بروسکەیەو
هەورەبانی حەزم ئەبزوێنێ
برینێکەو
زەریاچەی ناموێی دڵم ئەهەژێنێ،
ئەمشەو. .
خێڵی ژانی هەر چوار وزەت
لەخێڵ بەزی دڵی مندا ئارام دەگرێ
من توم ناوێ
چیتر ختووکەی برینەکانم مەدە
لەوە زیاتر پەنجەرەی دڵەکەم مەدە
من توم ناوێ. .
گەر لەبەهاری خۆشەویستیمان
گوڵ وەنەوشە
چاوی رەشی نەتروکێنێ
من توم ناوێ
گەر دەنگی تۆ
وەك چرنوکی بەچکە هەڵۆ
شووشەی خامۆشی وعوزبەتی
شەوانی ئەنگوستە چاوی ئەم شارە
. . نەشکێنێ!
ئای گیانەکەم . . تەمەنیکە
خۆشەویستیت تەزووی ئاخەو
رستەی مرواری ووشەی رەنگین
لەگەردنی شیعرەکانم دەپچرێنێو
تو بی دەنگی . . !
تەمەنیکی . . بەئاواتم
لە ریگای دژواری ئەم ژینەمدا
بەهاوریم بی . .



کە چی تازە . .
تۆ لەو دیووی پەنجەرەی پۆلاینەوە
بە تاسەوە تێم دەروانیو
وەك شەنگێ بی قەراغ کانی
لە ترسانا هەڵدەلەرزی

* * *

ئای گیانەکەم . .
چەن حەز ئەکەم . .
پرشنگی چاوی - تۆ - و کچانی شارەکەم
تەزووی سەوزی ماسگە شەوبێ
رووناکی بخاتە ژیلەموی چاوی
هەموو عاشقێ
چەن حەز ئەکەم . .
سەرنجە تیژ رەوکانتان
لەئاسمانی پر نهێنیم
وەك چەخماخەی بەردو ئەستێ
من ئەمەوێ . .
مرواری فرمێسکەکانتان
وەك ئاونگی سەر پەرەی گوڵ
گەش بنوێنێ
وەك بارانی ساڵی نەهات
لەنجە هیوای هەڵگرتبێ
لەرەی خەندەو پێکەنین حەشار دابێ .
هەموو شەوێ . .
زەنگۆڵ زەنگۆڵ بەئاسپایی
بەسەر ئێسکی گر گرتووما بتکێ
بەسەر ئێسکی گر گرتووما بتکێ

* * *

خێڵ بەز: خێڵ خستن لە شوێن هەواریکا

# چاوپێکەوتنێک لەگەڵ پرۆفیسۆر عیزەددین مستەفا ڕەسول دا



ماوەیەکە گۆڤارەکەمان لە هەر ژمارەیەکی دا چاوپێکەوتنێك لەگەڵ یەکێ لەبەرا نووسەری یان شاعیریان چیرۆك نووسانمان دا دەکات . . وا ئەمجارەش بە خۆشحاڵیەوە چاومان بە پرۆفیسۆر عیزەددین مستەفا ڕەسول کەوت و ئەم پرسیارانەمان ئاراستەی کرد . .

فۆاد حسین

**پ : لەم ڕۆژانەیەدا بازاری ڕەخنەی ئەدەبیمان گەرمە ، تارادەیەك توندوتیژی و هێرشی تیادایە؟**

و - . نازانم بڵێم بازاڕی ڕەخنەی ئەدەبیمان گەرمە ، یاساردە؟ بەهەموو بارێکدا زۆر دلگیر دەبم کەهەندێ جار لەتەلەفزیۆندا هەندێ نووسەر بێ سێ و دوو دەڵێن : ئێمەڕەخنەی ئەدەبیمان نی یە . ڕاستە زۆر لەو کتێبانەی بابەتی ڕەخنەی ئەدەبی یان تێدایە تێکەڵن ، واتە بابەتی مێژووی ئەدەب و ڕەخنەی ئەدەبی وتیۆریی ئەدەب و بیبلوگرافیاو تێکستە لۆژیشیان تێدایە . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕەخنەیەکی ئەدەبی گەش دەبینرێ ئەگەر بڵێین ڕەخنەی ئەدەبیمان نی یە ، ئەوا خەتێك بەسەر کۆششی ئەمین فەیزی وعەلی کەمال باپیر وڕەفیق حیلمی وشێخ نووریی شێخ ساڵح عەلائەدین سوجادیدا دێنین و کۆششی کە سانی دوای ئەوانیش دەسرینەوە .

بەڵێ ـ ڕەخنەی ئەدەبیمان هەیەو گەڵێك كەسی بەهرەدارلە مەیدانـدان ڕەنگـە بووتـری ڕەخنەكـەلـە پلەی بەرهـەم و ئیبـداعـەكـەدا نی یـە . ئەمـەش دیاردەیـەكی جیهـانیو مێژوویی یـە . لای هـەمـوو گەلانی جیهان ڕەخنە چەند سەدە پاش بەرهـەم و ئیبـداع دەستی پێكـردووەو زۆر دەگمەنیشە كەلە یەك پلەو رادەدابن .

هەرچی توندی وتیژی و كەس گرتنەوەیەو لادانەلەمەوزووعیەت ئەوە لێرەدا وەستا نێكم دەوێ چونكە لەم ڕێرەوی نووسینەمدا كەچـل ساڵ زیـاتـرەو ئەنجامـەكـەی دەیـان كتێب وسـەدان لێكۆڵینەوەو وتارە چیم لەسەر نووسرا بێ چی ڕەخنە گیرابێ ، بە دڵم بوو بێ ، یانا ، لام ڕاست بوو بێ یانا وەڵامم داوەتەوە نە هیچم ڕوونكـردۆتـەوە . بەڵام دوو جار بەزۆر ڕكێشـراومـە مەیدانی وەڵامدانەوەوە كە (كاشكی)ئەوەش نەبووایە .

من ڕوو دەكەمەوە هەموو ئەوانەو دەڵێم ـ با خەریك بن شتێك بۆ گەل و ولات ومێژ وو بنیاد بنێین و ئاسـۆی بیـرو كردارمان گەورەتـر بێ . ئەوەنـدەش هەیـە كەسێـك كە ڕەنـجێكی بوگەلەكەی نەدابێ ، ئاز ارێكی نەچشتبێ چۆن ڕێگە بەخۆی دەدا مێژ ووی ڕەنگینی خەڵكی تروفیداكاریـان بشێـوێنێ قسـەیـەكی تریش لەم مەیـدانـەدا ڕوو دەكـاتـە گۆڤـارو ڕۆژنـامـەكـانمـان ، ئەویش ئەوەیـەكـە نابێ هەرچی نووسـرا چونـەوا بلاو بكـرێتـەوە جاری واهـەیەهەندێ موناقەشە دەبینم ، ئەگـەر كەمێـك قارس كرێت ، یـاهـەنـدێ وشـەی ڕەقی لێ لابـرێت دەبێ بەمـوناقەشەیەكی مەوزووعیی باش یا ئاگاداری هەنـدێ نووسین بن كەلـە پشت پەردەوە ، یاكـورد وتـەنی ـ جولـەكـانە پلاری تێدایە لەگەڵ ئەمەشدا ڕەخنەی ئەدەبی ڕێی خۆی گرتـووەو چەنـد ڕەخنـەگری لێهاتوومان هەیە كەتەوژم بە بە بەرهەمی ڕۆژانەی نووسەران دەدەن .

**پ٢ هۆنراوەی ئەمرۆی كوردیمان لەچ ئاستێك دایە؟**

و ـ هۆنـراوەی ئەدەبیی ئەمـرۆمـان بەرهـەم و زادەی ئەمـرۆیە ؛ بەڵام دیـارە ئەمرو كوری دوێنێ و باوكی سبەینێ یە . من لەگەڵ دابـەشكـرانی دە ساڵـەی شاعیـران و نووسـەران نیم . چونكە ناتـوانم شاعیـرانی دیـاری وەك دیـلان و كاكـەی فەلـلاح و ع .ح .ب وعەلـی شەونم ناوبـنـێم شاعیـرانی چلەكـان یاپـەنجاكـان وحەسیب قەرەداخی وجـەمـال شارباژێـری و مەدحـەت بێخـەو بە شاعیری پەنجاكـان دابنێم ، چونكـە هەمـوویـان تا ئیستا بەرهەمی ڕەنگین و باشیان هەیەوو ئێستا شاعیـری ساڵانی نەوەد یا نەوەدەكانیش .

ڕەنگـە بتوانین ڕۆژ و ساڵی یەكەم بەرهەمی شاعیر بدۆزینەوە بەڵام هەر وەك ئەم شاعیرانە بەردەوامن ئەوەتا كەسـانی دووای ئەوانیش هەربـەردەوامن و بە هەمـوویـان سنـووریكی دیـاریكـراو بۆشیعـری نیـوەی دووەمی سەدەی بیستـەم نەخشە دەكێشن و ئەو مەشخەڵە هەڵدەگرن كەنـەوەی ڕابـەران (گـۆران وپیـرەمێردو شێـخ نووری ڤەدری جان)دامـەزرێنـەری ڕێبـازی بوون جا شیعـرێك چەنـدی شاعیـری چل ـ پەنجـا بێ سەنگـەری یان چوڵ نەكـردبێ و بەخشین نەكەوتبن و بووبنەهۆی هاتنە مەیدانی دەیان شاعیری لاو چۆن دەتوانین بە سەركەوتوو و بەردەوام وژ یاووزیندوویدا. نەنیین؟ ڕەنگـە هەمـوو شاعیـرە سەركـەوتـوو.بەخشندەكانمان پێش من دان بە مامۆستایی و ڕابەریی گۆراندا بنێن و بڵێن ـ ئێمـە گۆرانمـان تێدا نابێ . بەڵام گۆران لای منولای ئەوان تەنیا شاعیرو مرۆڤێك نی یە ، بەڵكو دیاردەیەكە كەسێكی بلیمەتە بووكە توانی پێـویستی و حەتمیەتی مێـژ وویی بەجێ بهێنێ ـ كە تازەكـردنـەوەی شیعـری كوردیی دەویست ئەم هەڵگـرتنـی مەشخـەڵـەش وا دەكات كەزنجیوی بەرەوپێشچوون و كاروان نەوەستێت و كاتێ پێـویستی وحـەتمیەتی مێژ وو تازەكردنەوەی تری بوێت ، ئەوا گەڵێكی زینـدووی وەك كورد بلیمـەتی تری تێدا هەڵدەكەوێ ئەمەش وا ناگەێنێ كە شاعیرانی پاش گۆران ـ یا ئەمـرۆمـان شەخسیەتی خۆیان نی یە ، یاهیچیان لە سامانی شیعـری كوردی زیـاد نەكـردووە . نەخێر ـ هەر یەكە خاوەنی شەخسیـەتی خۆیـەتی و لەهـەر یەكـە چێـژێكی تایبـەتی وەردەگـرین و هەر یەكـە شتێكی تایبـەتیـان لەوسامـانەزیـاد كرد وە كە گردبـوونـەوەی بەرە بەرەیا ن تازەكردنەوەو گۆڕینی گشتی و هەمەلایی دروست دەكات .

ڕەنگە مەبەستان لە پرسیارەكە باسی بەرهەمی ئەم چل ـ پەنجا ساڵە نەبێ كەڵێ دووام مەبەستان باسی كۆمەڵێ شاعیری لاو بێت كە موناقەشە دەربارەی بەرهەمەكانیان هەیە . من هەر لەو كاتـەدا كەسـەر شكێـنی وچـەپـۆك و ڕەقی و دووبـەرەكی لەمـونـاقـەشەدا بەڕاست نازانم ، داوای تەوازوع لاوان دەكەم و ئەوەش دەڵێم كەزۆر ڕ ێبازی ئەدەبی هەیەپاش سەرنەكەوتن و نەمـانی لە ئەورووپـا ئەوسا دەگـەنـە لای ئێمـەو لێـرە لاسـایی دەكـرێنـەوە . ، هەر وەك ئەو هەوڵ و تەقـەلاو لێهـاتـووەی ئەم لاوانـە دەبێ خزمـەتی بەرەو پێشچـوونی هێمنی ئـەو كاروانەی

شیعر بکات کەباسمان کرد. دڵنیاشم کە هەموو هەڵچوونو لادانێك لەواقیع وڕیرەوی مێژ وو وپێشکەوتن یاووشك دەکات، یابە هێمنی دێتەوە کوری راستەقینەی مێژ ووو وڵات و پێشکەوتنەوە زۆرم پێ خۆشە کە موناقەشەیەکی هێمن لە نێوان لاوان و

نەوەکانی پێش خۆیان. لە نێوان واقیعی یەکان و لاسایی کەرەوانی قوتابخانەکانی ئەوروپادا بەرپا ببێ تا پێکەوە بکەوین خزمەتی شیعری ئەمرۆمان و نە کۆششی لاوان غیرۆ بروا، نەهەڵگرانی چل ـ پە نجا ساڵەی ئەومەشخەڵە بچنە ناو قاوغێکەوەو ئەوئاسۆی بەرەو پێشچوونەیان لێ ون بێ کەساڵەهایە عاشقی ڕۆژ ی دەم کەلی ئەوەن.

**پ٣ ماوەیەك ڕۆمانی کوردیمان کپ بوو بوو بەڵام ئەوا چەند چیرۆك نووسێکمان دەستیان داوەتە نووسینی ڕۆمان بەرهەمەکانیان کەوتە بازارەوە؟ بەڕای جەنابتان تاچ ڕادەیەك سەرکەوتنیان وەدی هێناوە؟**

و- ڕۆمانی کوردی کپ بووە، یاتازە دەست پێدەکات؟ ئەوانەی نووسراون کامەیان ڕۆمانە؟ پێش ئەوەی بریارلەسەر ئەمانە بدەم، دەڵێم ئەگەر یەکێك لەو بەرهەمانەی باس دەکرێن، لە رووی مەرجە دیارەکانی ڕۆمانەوە بە ڕۆمان نەزانرا مانای وا نی یە خاوەنەکەی تاوانی کردووەو خراپەی لەگەڵ ئەدەب و گەلدا کردووە ئەگەر ئەم بەرهەم یا ئەو ڕۆمان نەبوو، ئەوسا دووپرسیار لای من دێتە پێشەوە ئەی کە ڕۆمان نی یە، دەچێتە ناو چ خانەیەکی بابەتەکانی ئەدەبەوە؟ ئینجا ئایالە کۆری ئەو بابەتەدا بەرهەمێکی ئەدەبی باش و سەرکەوتووە یانا؟کە سەرکەوتوو بوو لە بایەخی بەرهەمەکەو ڕێزی نووسەرەکە ناگوررێ

بەڵێ ـ ئێمە چونکە ڕۆمانمان کەمە لەبەر ئەوە ئەم چەشنە موناقەشەیە بەوتیژ و ناقوڵایی یە دەکەین پێش ئەوەی باسی سەرکەوتنی ئەم ڕۆمانە تازانە بکەم ـ دەڵێم: ئەم ڕۆمانانە یەکەم ڕۆمانی کوردی نین ـ مەبەسیشم کەمکردنەوەو هێنانە خوارەوە نی یە. بەڵام بۆڕاستی وتن دەڵێم ـ(شڤانێ کورد)ی عەرەبی شەمۆکە نزیکەی شەست ساڵ لەمەوبەر نووسراوە یەکەم ڕۆمانی کوردی یەو هەرعەرەبی شەمۆچەند ڕۆمانی تری هەیەو (خاتێ خانم)ی عەلی عەبدورەحمانیش هەر کۆنە. لەلایەکی ترەوە من وەك زوربەی ئەوگەلانەی ڕۆمان و نووسینیان هەیەو بارودۆخ وایکردووە بە زمانی خۆیان نەبێ

بەڵام ڕووداووگیان وتان وپۆی ئەتنوگرافیاو ناوی قارەمان و کەسانی هەرهی خۆیانن، لەبەر ئەوە بە مولکی خویانی دەزانن، منیش بەرهەمەکانی یەشار کەمال وعەلی ئەشرەفی دەروێشان و عەلی محەمەدی ئەفغانی کرماشانی و سەلیم بەرەکات بەڕۆمانی کوردی دەزانم چونکە هەر کردتن بە کوردی لە ڕۆمانی کوردی دەچن بەڵام هەزارجار بلزاك و دیکنزو تۆرگنیف و عەزیز نەسین وحەننا مینە بکەی بەکوردی نابن بە ڕۆمانی کوردی هەرچی باسی ڕۆمانەکانی (ئێستای ناوبازارە)- ئەوە (شار)وچ (کوێخا سێوی)و (هەڵکشان بەرەو لووتکە)و (کۆردەرە)ڕۆمانی سەرکەوتوون و دەستی نووسەرەکانیان خۆش بێ. هەرچی خاسیەتی تایبەتیی هەر یەکە لەم ڕۆمانانەیە کە هەندێ جار لە بابەتی ئەدەبی تریان نزیك دەکانەوە، یا ڕەنگەلە نووسەری تریان نزیك بخاتەوە، ئەوە خاسیەتی نووسەرەکە خۆیەتی تۆچی لە نووسەرێك دەکەیت فۆلکلۆر زۆرکاری تێ کردبێ؟ دەڵێی ـ لە هەموو وێنەو تام و وشەی فۆلکلۆر خۆت بە دوور بگرە؟ یا نووسەرێك زمانەکەی شاعیرانە بێ ـ بەزۆر وای لێ دەکەیت واز لەو زمانە بهێنێ کە دیارە بەچە. شنێکی تر ناتوانێ بنووسێ یانووسەرێك خوێندنەوە وای لێکردووەهەندێ دیمەنی بەرهەمی ئەوروپایی بە نووسینی یەوە دیاربێ چیی لێدەکەین؟ هەر نووسەر شەخسیەتی خۆی ئامێری خۆی، تواناو بەهرەی خۆی هەیە.

دەبێ لیێ بگەرێن وتەنیا حسابێك کە لەگەڵی بکرێ ئەوەیە ئایا بەرهەمەکەی خزمەتی ئەدەب و گەل و پێشکەوتن دەکا یانا ـ ئەم خزمەتەش لە سنوورێکی فراواندا لێك دەدرێتەوە. ئەمیل زۆلاو هەمنگوای و گۆرکی و ئەمادۆو مارکێز لە زۆرشتێداجیان ونابن بە یەك هەندێك دەڵێن ڕۆژ ی گۆرکی ڕۆیشت وئێستا کاتێ بابەتەکەی مارکێزە. بەڵام من لام وانی یە ئەکەرهونەرمەندێك هەبێ سەرکەوتوویی ئەو ڕێبازی ئەو بگرێ ئەوا هەر سەرکەوتووە.

**ب٤ بەڕای من خوێنەوار وەکو جاران نەماوە کە زۆر بە پەروشی خوێندنەوە بێت هۆی ئەمە چی یە؟**

و- بەڵێ ڕاستە - هۆش زۆرە. فراوانبوونی ، زۆر بوونی ئەرك و کار، پێوەندیی ئەمڕۆو دوواڕۆژ لای نەوەی نوێ ئینجا ئەو بەرهەمانەی تەکنیك کەجێی خوێندنەوە دەگرن: ڕادیۆ ، تەلەفزیۆن، سینەما، ڤیدیۆ. هتد. بەڵام ئەمە مانای وا نی یە کە خوێندەواران هیچ گوناهیان نی یە. نەخێر. . کەمتەرخەمی یەك لای خوێندەوارانی ئەمڕۆ هەیەلای زۆربەیان کات وا ڕێکنە خراوە کەخوێندنەوە کاتی تایبەتی بۆ تەرخانکرابێ پاشان - بەداخەوە گەلێك لە خوێندەوارە کانمان تەنیا یەك بابەت دەخوێننەوەو گوێ نادانە ڕۆشنبیریی گشتیی و زانینی هەمەلایی و هەمەڕەنگی کەئەمە پێویستە بۆ خوێندەوار بەتایبەتی بۆ شاعیرو نووسەر، پێش هەمووانیش بۆ چیرۆکنووس



**پ ٥ چ ئامۆژگاری‌یەکتان هەیە بۆ پێشکەوتنی گوڤارەکەمان بەتایبەتی جەنابتان ڕاوێژگاری دەزگای ڕۆشنبیری بڵاوکردنەوەی کوردیت؟**

و- گوڤارەکە ڕێی خوی گرتووەو دەڕوا. خەریکە بەتەواوی لەناو گوڤارە کوردی‌یەکاندا ئیختیساسی خۆی پەیدا دەکاو شوێنی دیار دەبێ لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ جار ئەو پارسەنگەی دەبێ لەنێوان بابەتەکان و خاوەن بەرهەمەکاندا (لەکۆن وتازە. . یا بڵێین پیرولاو- ناسراوو نەناس راو دا ڕابگیرێ تێك دەچێ کە دەبێ هەمیشە ئاگامان لەم لایەنە بێت. پاشان دەبێ - ئاگاداری ئەو فایلە زلانەی گوڤارەکە بین زۆر بەرهەم هەیە دەمێکە لاتان نووستوە - یا بڵاوبکرێنەوەیا وەڵام بدرێنەوە ئەگەر وەك گوڤاری (کاروان)ئیستمارەی وەڵامدانەوە هەبێ باشە. لەلایەکی ترەوە دەستەی نووسەران ئێستا لەدەستەیەکی شارەزا دەچن کەجیا بەجیا شت دەخوێننەوەو بریاری لەسەر دەدەن. ئەگەر کارەکەیان لەمە زیاتر بێ و هەندێ جار پێکەوە ڕابدەن و کۆ ببنەوە کارەکەو گوڤارەکە باشترو پوختتر دەبێت. دوواشت . . سوپاستان دەکەم وئەگەر لەناو هێنانی شاعیرو نووسەرو بەرهەمدا ناوی شایانم لەبیر چووبێ داوای لێبوردن دەکەم ومەبەسم لە بیربردنەوە نەبووە.

# دوو پارچە شیعر

محمود خسرو کاوانی
هەولێر /١٩٨٨

١- تۆو شیعر

لەو شەوانەی ئەوینی تۆو
کۆپلە شیعرێ لە دەرگای خەیاڵم دەدەن
نازانم کامتان پێش کامتان بکەمە ژوور
بۆ کامتان زووتر بشکێنم سۆزی سنوور
ئەوینی تۆ یاخۆ شیعر
شیعر یاخۆ ئەوینی تۆ
گیانە چی بکەم
هەردوو کۆرپەی ناخی منن و . .
بەخوێنم دەکەن هاتووچۆ

٢- تۆ کانیلکەی خۆشەویستی

لێوەکانت وەکو چرۆی داری بەهار
ناسك و پاراو و تەرن
ووتەکانت سەمفۆنیانەو
لەگەڵ خەیاڵم هاوسەرن
نیگای وێڵت
گروگەرمی بڵێسەی خۆشەویستینە
چاوی مەستت
پر لە عیشق و تەلیسم و جوانی و مەستینە
خەندەو بزەت
جوانترین گوڵی رووخسارن
زستانی بەستەڵەك بەرن ،
وەك بەهارن ،
بەچەشنی ئەستێرەی ئاسمان
پر رووناکی و پرشنگدارن
تۆ تابلۆیی و . .
منیش لەگشت کەسێکی تر
تامەزرۆی بینینی تۆ
تۆ کانیلکەی خۆشەویستی و
منیش تشنەی ئەوینی تۆ



# زەبری ووشە

نەبەز رضا فتح الله

گەر جارێك بێت و
خۆری پرچ زێرین وا بیرکاتەوە
لەبەر ئاوێنەی ئاسۆی خاکم دا
تاڵ تاڵ بەقژیا شانە نەهێنێ و
شی نەکاتەوە ! !
گەر مانگیش ویستی
بۆ شەوێکی تر داوی تریفەی ،

لە جێ هەنگاوی
رێی سەختی دووری پیاوانی شەورو
جوان نەنێتەوە
دەستی سۆزی خۆی
نەهێنێ بەسەر عاشقەکانیا ! . .
سا مەرجە منیش :
بۆ ئەوەی ژووانگەو
تووڵە رێگاکان . . رۆشن بێتەوە
شیعری وا دانێم ،
بە زەبری وشەی . .
سەد مانگ و خۆری لێ بێتەوە !

# وەلی دێوانە لە چەند دێرێك دا

لە ناو کوردەواریدا، ناوی (وەلی و (وەلید)یش هەن و زۆربەی کات و لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان دا هەردوو جۆرەکە، بە (وەلی)بانگ دەکرێن.

ساڵی لە دایکبـوونی (وەلی)بـە تەواوی و بە ڕێـك وپێکی و بەبێ زیـادو کەم نازانـرێ و ئەوانـەش، کە لە بارەی لە دایکبـوونـی (وەلـی)یـەوە، دواون، دوانیـان یەکیـان نەگـرتـووە، بەڵام لە دیـاریکـردنی ساڵی مردنیدا زوربەیان لەگەڵ ئەوەدان، کەلە ساڵی (١٢١٣)ی کۆچی دا کۆچی دوایی کردووە.

وەلی لەنـاو هەرەتی کە ڕەجـافـەکـانەدا وەك شاعیرێکی هەڵکەوتوو سەری دەرهێنـاوەو ناووچـامیشی لە لایـەن سەرپـاکی کەڵـە شاعیـرەکـانی ئەو دەمـەوە، زانـراوەو بەرێـز ەوە تەماشای خۆیشی و بەرهەمیشی کراوە.

وەلی لەناو خێزانێکی کەڕەجافی گەرمیان وکوێستان ـ کەردا ، ژیاوەو سەرپـاکی هەڵس و کەوت و عەشـایـر گەریی و هۆزگەریی ولایەنی کۆمـەڵایـەتی ، ئەو هۆزە جافـانـە، لەنـاو بەرهەمە ڕەنگینەکانیدا، ڕەنگی داوەتەوە.

شاعـیـرێـکـی وەك مەلا عومـەری ڕەنـجـووری (١٨١٠ـ ١٨٨٠)دەسپێشخـەری کردووەو نامـەی بۆ وەلی دێـوانـە، بەناوی میرزا وەلی ـ یەوە، بۆ نووسیوەو داواشی لێ کردووە، کە وەرامی بداتەوە.

مەلا عومەری ڕەنجوری ،وا لە قەڵەمی دەدات، کە هەرکەسێ لە زەبری وەلی ـ یەوە دێ، ئەم یەکسەرە، هەواڵی ئەوی لێ دەپرسێ و ئەم نامەیشیە بۆ ئەوەیە، کە خۆی ، بە میرزا وەلی، بناسێنێ.

بەم بۆنەیەشەوە، وا ئەم وەرگرتەیەی نامەکەی ڕەنجووری ،کە بۆ میرزا وەلی نووسیوە، دەخنەینە بەرچاوو دەڵێ :

**«هەرکەسێ ، مەبۆ، نەوراگەو جیوە**
**بەو موڵك و مەکان نامی تۆ پێوە**
**تاقێ پێش ماچوون پەرەی جست و جۆت**
**پەیم بارۆ ئەحواڵ جەستەی خەم بێ شۆت**
**بەڵام میرزای خاس عاقیەت وەخەیر**
**تۆ جەبارەی من هیچ نەداری مەیر.**

تادەگاتە ئەوەی کە دەڵێ : . . . . .
**ئومێدەن (میرزا)، (من بعد الایام)**
**نامە ئینشای تۆ ،کە نەبۆ جەلام.»**

لە بارەی وەلی دێـوانـەوە، زۆربـەی نووسـەرەکـانمان ئەوانەی لە بارەی وەلی دێـوانـەوە، نووسیـویانە، وا لە قەڵەمیان داوە، کە وەلی شاعیـرێکی نەخـوێنـدەوار بووە. ئەگەرچی خوێندەواریی (وەلی)و نەخـوێنـدەواریی ،هیـچ نەلـە شاعیـریـەتی (وەلی) کەم دەکاتەونە لێیشی زیاد دەکات بەڵام تەنیا نابرەوی یەك، لە واتای وەهادا بەدیی بکـرێ ئەوەیـە کە ئەوانـە : نە بە وردیی بەهـەمـەکـانی (وەلی)یـان خوێنـدووەتـەوە ، نە بەچاوی پشکێنەرەوە قاقەزەکەی مەلا عومەری ڕەنجووریيان داوەلە سەنگی مەحەك.

جگـە لەو بەڵگـەنامانەی، کەلە بەرهەمەکانی (وەلی)خۆیدا هەن و لەنـامـەکـەی مەلای ڕەنجووری دا بەدیی دەکرێن، (وەلی)خۆی ، وەك هەستی شەشـەمی پێی وتبی و ئاگـاداری دووربینی دوا ڕۆژی کردبێ لە پارچـە هۆنـراوەیـەکی ، باسی ئەوە دەکـات، کەهـەرچی بەرهـەمی هۆنـراوەی هەبـووە، سەرپـاکی لە دەفتەردا تۆمار کردووەو ئەویش بەم جۆرەیە :

**یەك یەك، جەم کەردم، تەمام سەراسەر**
**تەمام ، ئاوەردم ،گشت دام، لە دەفتەر»**

(م. هـ. ر. وەلی ل ـ ٥٤)

ئەوجـا، دەبێ لێـرەدا، بڵێین. ببـوورن، چونکە ئێرە، هەر ئەمەندە دەگرێتە خۆی.

بەيان مجلة ادبية شهرية
تصدر عن وزارة الثقافة والاعلام
دار الثقافة والنشر الكردية بغداد

رئيس التحرير
فؤاد حسين احمد



BAYAN
Literary Monthly Magazine
Ministry of culture and information
Issued by: The Kurdish House for
Culture and Publishing
Baghdad - Iraq

EDITOR IN CHIEF
FUAAD - H - AHMAD

نرخی (٥٠٠) فلسه